زنجیرە ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست (٢٠)

# غەیبەت

# و

## شوێنەوارە خراپەکانی لە سەر تاک و کۆمەڵ

بە پێنوسی

حسین بن عودة العوايشة



وەرگێڕانی بە دەستکارییەوە

م. شاخەوان جەواد

(پێش نوێژ و وتارخوێنی مزگەوتی سەید ئەحمەدی فەیلەسوف لە چەمچەماڵ - پێبادی)

زنجیرە ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست (٢٠)

# غەیبەت

# و

# شوێنەوارە خراپەکانی لەسەر تاك و كۆمەڵ

بەپێنووسی:

حسين بن عودة العوايشة

وەرگێڕانی بەدەستکاریەوە:

م. شاخەوان جەواد ئەحمەد

پێش نوێژو وتار بێژی مزگەوتی (سەید ئەحمەدی فەیلەسوف)

لە چەمچەماڵ- پیریادی

چاپی پێنجەم

١٤٣٢ کۆچی - ٢٠١١ زاینی

# پێناسەی پەرتووك


**ناوی پەرتووك:** غەیبەت و شوێنەوارە خراپەكانی لەسەر تاك و كۆمەڵ

**نوسینی:** حسين بن عودة العوايشة

**وەرگێڕانی بەدەستكاریەوە:** م. شاخەوان جەواد ئەحمەد

**ساڵی چاپ:** ١٤٣٢ كۆچی – ٢٠١١ زاینی

**شوێنی چاپ:** چاپخانەی زانا

**نۆبەتی چاپ:** چاپی پێنجەم

**تیراژ:** (١٠٠٠)

**ژمارەی سپاردن:** (٣٤٦) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێ دراوە.

**بنكەی بڵاوكردنەوە:** كتێبخانەی سیـــما لە چەمچەماڵ (٠٧٧٠١٢٣٦٠٨٩)

كتێبخانەی سـوننە لە سلێمانی.

كتێبخانەی زانسـت لە كەلار.

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله نحمده ونستعينه، ونستغفره، ونعوذبالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾(آل عمران: ١٠٢)

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾ (النساء: ١)

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ (الأحزاب: ٧٠-٧١)

أما بعد :

فإنَّ خَيرَ الحَديثِ كتابُ اللهِ، وَخيرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّد ﷺ، وَشَرَّ الأمورِ مُحْدَثاتُها، وكلُّ مُحدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلالَة، وَكُلُّ ضَلالَةٍ في النّار.

## پێشەکی:

برایـان و خوشـکانی زۆر بـەڕێز ...... لەڕاسـتیدا بەپێویـستم زانـی لـە خزمـەتی بەڕێزتانـدا بابـەتێکی وا پێـشکەش بکـەم کـە گومـانی تێدانییـــە بەشـــێکی زۆرو بـــەربلاوی کۆمەڵگـــەی داگیرکـــردوەو هۆکـارێکی گرنگیـشە بـۆ لـەناوبردنی چـاکەکان، بۆیـە ئـەو تاوانـەش (غەیبەتـە) بەڕاسـتی پـەڕەی ناسـکی دڵ دەڕاکـێنێ و دەشـبێتە هـۆی پەیـدابوونی ڕق و کینـەو بـوغز لـە نێـو موسـوڵمانان‌دا، هـەروەها ئـەنجام نـەدانی غەیبـەت و خۆگرتنـەوە لێـی ڕاسـتە بـەدەم کـارێکی ئاسـانە بـەڵام بـەکردەوە زۆری دەوێـت و گرانیـشە، بۆیـە ئـەی ئەوانـەی بـە نهـێنی ئـازاری خوشـکان و برایـانی موسـوڵمان دەدەن لـە خواپترسـن و پەشـیمان ببنـەوە، چـونکە بەڕاسـتی لـە ڕۆژی دواییـدا دەبنـە هـەڵگری کـوڵێ تـاوانی ئـەوان و هیـچی تـر، خۆشەویـستانم گومـانی تێدانییـە کـە غەیبـەت بـە زمـان دەکرێـت هەنـدێ جـاریش بـە ئیـشارەت و شـتی تـر، بـەڵام ئـەوەی مەبەسـتە لێـرەدا تـەنها زمانەکـەی، **زمـان: ئـەو ئـامێرە گۆشـتینەیە کـە خـوای میهرەبـان بـە مرۆڤـەکان بەخـشیوە، هەرچـەندە ئـامێرێکی قـەبارە بـچووکە بەڕاسـتی بەشـێکی گـەورەی باوەڕیـشی لەسـەر بەنـدە،** بەڕاسـتی بـەڕێزانم کاتێـک خـەڵکی لـە ڕۆژی دواییـدا لەسـەر دەم و چـاویان ڕاپێـچی دۆزەخ دەکـرێن تـەنها بـەهۆی زمانەوەیـە کەواتـە بیپـارێزە،

وەبزانە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هەموو شتێك کە زیاتر لێی ترسابێت زمان بووە، بۆیە براو خوشکی بەڕێزم .... زۆر پێویستە موسوڵمان ئەوە بزانێت کە زمان گەورەترین ئالەتە بەدەست شەیتانەوە بەوەی کە چۆنی بوێت ئاوا دەیگێڕێت، ئەویش بەوەی ڕۆچوون لەهەر تاوانێکدا کردنەوەی دەرگایەکە بە ڕووی شەیتاندا، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هۆگرو چاکەی مرۆڤی بەستۆتەوە بە زمانەوە، هەروەك دەفەرموێت: ((لاَ يَسْتَقِيمُ إِيمَانُ عَبْدٍ حَتَّى يَسْتَقِيمَ قَلْبُهُ وَلاَ يَسْتَقِيمُ قَلْبُهُ حَتَّى يَسْتَقِيمَ لِسَانُهُ))[1].

واتە: باوەڕی هیچ کەسێك دانامەزرێت هەتاکو دڵی دانەمەزرێت، وەدڵیشی دانامەزرێت هەتاوەکو زمانی دانەمەزرێت، کەواتە زۆر پێویستە ئاگاداری زمانت بیت، چونکە لێکدەرەوەی باوەڕتە، هەڵگری نهێنیەکانی ناختە، زمانت بپارێزە باوەڕت پارێزراوە.

✍ م.شاخەوان جەواد ئەحمەد

٢٧ جەمادی دووەمی ١٤٣٠ کۆچی

---

(١) مسند أحمد (١٣٣٨٩) ، سلسلة الاحاديث الصحيحة (٢٨٤١) .

## هەندێك لەو ئایەت و فەرموودانەی كە بەڵگەن لەسەر حەرامێتی (غەیبەت) كردن

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱجْتَنِبُوا۟ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ ۖ وَلَا تَجَسَّسُوا۟ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ﴾ (الحجرات:١٢).

پێشەوا إبن كثیر (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: هەڕەشەی گەورەو سەرزەنشتی توند دەربارەی (غەیبەت) كردن هاتووە، بۆیە خوای گەورە غەیبەت كردنی چوواندوە بە خواردنی گۆشتی مردوو، هەروەك دەفەرموێت: ﴿أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ﴾، ئایا موسوڵمانان هەریەكێك لە ئێوە ئارەزووی خواردنی گۆشتی براكەی بە مردوویی دەكات؟ كە حەزیش ناكەن و پێتان ناخۆشەو بۆشتان ناخورێت، كەواتە چۆن گۆشتی براكەتان بە مردوویی پێناخورێت و بەلاتانەوە ناخۆشە دە ئەوهاش بە زیندوویی مەیخۆن (واتە غەیبەتی موسوڵمانان مەكەن و دەست درێژی مەكەنە سەر كەسایەتی و ئابڕوو شەرەفی، چونكە سزای غەیبەت كردن زۆر لە خواردنی گۆشتی مردوو ناخۆشترو قورسترە)[1].

---

[1] بڕوانە: تفسیرالقرآن العظیم للأمام ابن كثیر (٧ / ٢٩٠).

موسوڵمانە خۆشەویستەکان ئەگەر دەتانەوێت هەست بە شاراوەیی و ڕاستێتی غەیبەت بکەن ئەوە بڕواننە سفرەیەکی دوورو درێژی ڕازاوە، بەڵێ ڕازاوە!! بەچـی ڕازاوە؟ بە گۆشتی مرۆڤێکی مردوو، ئایا کەسێك بێزی ئەوەی دێت لەو خواردنە بخوات کە گۆشتی مرۆڤە؟!! نەخێر، بەڵام کەسانێك کە ئاگایان لە زمانی خۆیان نییەو لاشەیان لاشەی مرۆڤە و دڵیان دڵی گورگە بەر دەبنە گیان ئەو مردووەو بە ددانیان گۆشتیان دەپچڕن و بە زمانیان دەیلێسنەوە، ئایا ئەو کەسانەی ئەوە دەکەن دەبێ مرۆڤـ بن یا جۆرێك لە دڕندە گۆشت خۆرەکان بن، ئەی دەبێ ئەو لاشەیەی کە سفرەکەی پێ ڕازاوەتەوە بێ ئاگاو بێ دەسەڵات بێت لە بەرەنگاری کردن لە خۆی، پاشان ئەوەی غەیبەتی دەکرێ و گۆشتی دەخورێت بەبێ ئاگا کەسێکی خۆی بێت و یان برای دینیت بێت؟ دەبێت چەندێ قێزەون بێت.

## فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر غەیبەت

١. هاوەڵی بەڕێز مُطَّلِب کوڕی عبـــدالله (خـوا لێـی ڕازی بێـت) دەفـەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ)) [1].

واتە: غەیبەت کردن ئەوەیە کە باسی کەسێك (موسوڵمانێك) بکـەیت لـە پاش ملە بەوەی کەتیایەتی.

---

[1] سنن أبي داود (٤٨٧٦)، السلسلة الصحيحة (١٩٩٢)

٢. هاوەڵی بەڕێز أبوهریرة (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (( أتدرون مالغيبة؟ قالـوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أعلَم. قال: ذِكْـرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ))[1].

واتـە: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: ئایـا دەزانـن غەیبـەت چییە؟ ئـەوانیش فـەرموویان: خـواو پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) باشـتر دەزانـن، جـا فـەرمووی: غەیبـەت ئـەوەیـە کەباسـی براکـەت بکـەی بـەوەی کـە پێـی ناخۆشە.

٣. هاوەڵانی بەڕێز أبو برزة الأسلمي وبراء کوڕی عازب (خوا لێیان ڕازی بێت) فەرموویانە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((يَا مَعْشَرَ مَنْ آمَنَ بِلِسَانِهِ وَلَمْ يَدْخُلِ الإِيمَانُ قَلْبَهُ لاَ تَغْتَابُوا الْمُسْلِمِينَ وَلاَ تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ فَإِنَّهُ مَنْ يَتَّبِعْ عَوْرَةَ أَخِيهِ يَتَّبِعِ اللَّهُ عَوْرَتَهُ حَتَّى يَفْضَحَهُ فِي بَيْتِهِ))[2].

واتە: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ئـەی ئـەو کەسـانەی بـەدەم باوەڕتـان هێنـاوەو ڕاسـتێتی بـاوەڕ نەچـوّتە نێـو دڵتانـەوە، غەیبـەتی موسوڵمانان مەکـەن و شـوێنی عەیبـەو کـەم و کوڕییـان مەکـەون، چونکە هەرکەسێك بەشوێن عەیبەو کەم و کوڕی موسـوڵماناندا بگـەڕێت و باسـیان

---

[1] سنن أبي داود (٤٨٧٦)، صحيح مسلم ( ٢٥٨٩)

[2] مسند أحمد (٢٠٣٣٢)، صحيح سنن أبي داود ( ٤٠٨٣)، الترغيب والترهيب ( ٢٣٤٠) .

بكات ، ئەوە خوای گەورە كەم و كورپیەكانی هەڵدەماڵێت و سەر شۆڕو بێ نرخی دەكات ئەگەر لە ناوماڵی خۆشیدابێت.

## غەیبەت چی یە ؟

موسوڵمانە خۆشەویستەكان لەو فەرموودانەی پێشوو كە باس كران ئەوە ڕوون بووەوە كە تۆ باسی هەر موسوڵمانێك بكەیت (پیاو بێت یان ئافرەت) لە پاشملە وە پێی ناخۆش بێت و ئەو شتەشی تیابێت كەتۆ باسی دەكەی، غەیبەتە و حەرامەو دروست نییە مەگەر لە چەند كاتێكدا نەبێت كە (إنشاءالله) لەمەودوا باسی دەكەین.

ئیمامی غَـزالي (رەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمووێت: بزانە سنوری غەیبەت ئەوەیە: كە تۆ باسی هەر موسوڵمانێك بكەیت لە كاتێكدا ئەو باسەی پێبگاتەوەو بیبیستی پێی ناخۆش بێت، جا باس كردنەكە دەربڕینی كەم و كوڕیەك بێت لە لەشیدا یان عەشیرەت و كەس و كاری، یان كردەوەكانی، یان قسەو گوفتاری، یان دینەكەی، یان ژیانی دونیاكەی، بەڵكو باس كردنی جل و بەرگ و ماڵ و خانو ئاژەڵ و سەیارەكەی، هەر هەمووی دەبێتە غەیبەت.

ئیمامی حَسَن (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: باس کردنی موسوڵمان کاتێك پێی ناخۆشە باس بکرێت لە پاشملە سێ جۆرە:

١. **غەیبەت**: باس کردنی کەم و کوڕیی موسوڵمانێکە ئەگەر پێی ناخۆش بێت دەبێتە غەیبەت با ئەو شتەشی تێدابێت کە تۆ باسی دەکەیت.

٢. **بوهتان**: باسی موسڵمانێك بکەیت بە شتێك کە تێیدا نەبێت، لەم کاتەدا هەم تاوانی غەیبەتت بۆ دەنوسرێت و هەم تاوانی بوهتانەکەش.

٣. **درۆ بۆ هەڵبەستن**: باس کردنی شتێکی خراپە دەربارەی موسوڵمانێك کە پێت دەگات و تەئکید نیت لەسەر ئەوەی ڕاستە یان نا، جیاوازی ئەم خاڵە لە گەڵ خاڵی دووەمدا ئەوەیە کاتێك شتێکی خراپ دەربارەی موسوڵمانێك دەووترێت تۆش یەکسەر بڵاوی دەکەیتەوە بۆ ئابڕو بردن وناشرین کردنی ئەو موسوڵمانەتە، هەروەك چۆن مونافیقەکان درۆی داوێن پیسی کردنیان بۆ دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشة "خوای لێ ڕازی بێت" هەڵبەستوو کەسانێکی ئیمان لاوازیش بێ گوێ دان بەڕاستی یان درۆیەتی ئەم بوهتانە کەوتنە بڵاو کردنەوەی، لەم کاتەدا هەم تاوانی غەیبەت و هەم تاوانی بوهتان و هەم تاوانی درۆ بەدەم هەڵبەستنت بۆ دەنوسرێت.

موسوڵمانی خۆشەویست ئەوەی بۆ دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشة"خوای لێ ڕازی بێت" هەڵبەسترا، خوا گەورە لە سەرووی

ئاسمانەکانەوە بەدرۆی خستەوەو ئایەتی لەسەر ئەو کەسانە دابەزاند کە ئەو درۆیەیان هەڵبەستبوو.

## یەك دەنگی زانایان لەسەر حەرامێتی ( غەییەت ) وە جۆرێکیشە لە تاوانە گەورەکان

زانای پایەبەرز إبن كثير (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەتەفسیری سورەتی "الحجرات" ئایەتی (١٢)دا دەفەرمووێت: غەیبەت کردن حەرامە بەیەك دەنگی و کۆڕای زانایان، وەهیچ جۆرە غەیبەتێك دروست نییە مەگەر باس کردنی کەسێك کە لە باس کردنەکەیدا خێرو سوودی زیاتر بێت، هەروەکو باس کردنی لایەنی خراپی کەسێك یان ئامۆژگاری کردنی.

وە هەروەها زانای پایەبەرز ئیمامی القرطبي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمووێت: زاناکان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە (غەیبەت) کردن حەرامەو تاوانێکی گەورەیە *، بۆیە پێویستە تەوبەی لیّ بکرێت.

---

* : تاوانە گەورەکان ئەو تاوانانەیە کە خوای گەورە هەڕەشەی گەورەی لیّ کردووە و سزای گەورەشی بۆداناوە لەدونیاو قیامەتدا، وە تاوانە گەورەکانیش خوا لێی خۆش نابێت مەگەر بە

هــەروەها پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) بــە خــاتوو عائیــشەی فــەرموو: ((لَقَدْ قُلْتِ كَلِمَةً لَوْ مُزِجَتْ بِمَاءِ الْبَحْرِ لَمَزَجَتْهُ))[١].

واتە: بەڕاستی ئەی عائیشە قسەیەکت کرد ئەگەر تێکەڵ بکرێت لەگەڵ ئاوی دەریاکان تێکی دەداو تام و بۆنی دەگۆڕی. ئەمەش لەکاتێکدا بوو دایکمان خاتوو عائیشە (خوای لێی ڕازی بێت) فەرمووی: ((حَسبُكَ مِن صَفيّةَ "كذا وكذا" وفي رواية أنها قَصيرَةٌ))، واتە بەسە ئەی پێغەمبەر (ﷺ) چیت داوە لە(صَفيَّة) خۆ ئەو ئاواو ئاوهایە. واتە بالآی کورتە، جا توخوا ئەگەر خاتوو عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) تەنها ئەو چەند ووشەیەی ووتبێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو شێوەیە وەلآمی دابێتەوە ئەی دەبێت کەسانێك چیان پێ بوترێت و حوکمیان چی بێت؟ کە بە شەوو ڕۆژ دەمیان بە باس کردن و دەم بۆسەر خەڵکی درێژ دەکەن و باسیان دەکەن و کەم و کوڕیەکانیان هەڵدەدەنەوە. بەبێ گوێدان بە حەرامی و ترسناکی تاوانەکە (پەنا بەخوا) .

---

تەوبەکردن و گەڕانەوە نەبێت لێی، یان مەگەر خوای گەورە خۆی ویستی لێبێت خۆی لە دواڕۆژدا لێی خۆش دەبێت.

[١] صحيح سنن أبي داود (٤٠٨٠).

## چۆن خەڵکی غەیبەت کردنی لێ گۆڕاوە

## (هەندێ شت هەیە غەیبەتەو خەڵکی بە غەیبەتی نازانن)

خوشـک و بـرای خـۆم.... بەڕاسـتی شـەیتان و سـەربازە مانـدوو نەناسـەکانی فێـڵ و تەڵەکـەیان زۆرە بـۆ ئـەوەی بەنـدەکانی خـوا تووشـی تاوان وسەرپێچی و غەیبەت بکەن، لەوانە:

**یەکەم:** هەندێ کەس دەڵێن: ئەوەی کە ئێمە باسی دەکەین هـەمووی لـەو کەسـەدا هەیـە و خوڕەوشـتی وایـە، بۆیـە ئاسـاییە ئـەو بـاس کردنـە غەیبەت نییە. جا بۆ وەڵامی ئەم گومانە سێ فەرموودەی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) باس دەکەین

١. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((الغيبةُ أن تَذكُرَ الرَّجلَ بِما فيه مِن خَلفِه))[1].

واتە: باس کردنی موسوڵمانێك لەپاشملـە غەیبەتـە بـا ئـەو ڕەوشتەشـی تێدا بێت کە تۆ باسی دەکەیت.

---

(١) صحيح الجامع الصغير(٤١٨٦).

٢. هــاوەڵی بــەڕێز أبــو هریــرة (خــوای لــیّ ڕازی بێـت) دەفــەرمووێت: پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) فەرموویــەتی:(( ئایــا دەزانــن غەیبــەت چــییە؟ هــاوەڵانیش فــەرمویان: خــواو پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) باشــتر دەزانــن. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: غەیبەت ئەوەیە کە باسی براکەت بکەیت بەوەی کەپێی ناخۆشە، ووترا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەی ئەگەر ئەوەی کە باسمـان کـرد لـەو کەسـەدا هـەبوو، ئـەویش فـەرمووی: بـەڵێ ئەگـەر ئـەو شتەشی تێدا بوو دەبێتە غەیبەت، وەئەگەر تیایدا نەبوو ئەوە بوهتانە)) .

٣- فەرموودەکەی هـاوەڵی بەڕێز أنس کوڕی مالك (خوا لێی ڕازی بێت) کـە دەفـەرمووێت: ((كانَت العَرَبُ يَخدمُ بَعضُها بعضَاً في الأسفارِ، وَكانَ مَع أبي بَكرٍ وَ عُمَرَ رَجُلٌ يَخدمُهُما، فَنامَا، فَاستَيقظا، وَلَم يُهَيّئ لَهما طَعامَاً، فَقــالَ أحَدُهُما لصاحِبه: إنَّ هذا لَيُوائِمُ نَومَ بَيتِكُم، فأيقضاهُ، فَقالا: إئْت رِسولَ الله (ﷺ) فَقُلْ لَهُ: إنَّ أبا بَكرٍ وَعُمَرَ يُقرِئانكَ السَّلامَ وَهُما يَستَأدمانكَ، فَقــالَ: ائْتَدَمَا فَفَزِعا فجاءا إلى النَّبيِّ (ﷺ) فقالا: يارسولَ اللــه (ﷺ) بَعَثنــا إليــكَ نَستأدمَكَ، فَقُلتَ: ((قَد ائْتَدَما)) فَبأيِّ شَيء ائتَدَمْنا؟؟ قال: بِلَحْمِ أخيكُمــا، والذّي نَفسي بِيَدِه إنّي لأرَى لَحمَهُ من أنيابِكُما قالا: فَاستَغْفِرْ لَنا، قال: هُــوَ فَلْيَستَغْفِر لَكُما)) [1].

---

(1) أخرجه الضياء المقدسي في ( الاحاديث المختارة )، السلسلة الصحيحة (٢٦٠٨).

واته: لەناو عەرەبدا وا باو بووە کاتێك گەشتیان دەکرد خزمەتکاریان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد تا خزمەتیان بکات، ئیمامی (أبوبكر وعُمــر) (خـوا لێیـان ڕازی بێـت) پیاوێکیـان لەگەڵدا بـوو بـۆ ئـەوەی خزمـەتیان بکـات و خواردنیان بۆ ئامادە بکات، جا هـەردوو پێشەوا (خـوا لێیـان ڕازی بێـت) خەوتبوون کاتێك بەخەبەر هاتن بینیان پیاوەکە خـەوتووەو خـواردنی بـۆ ئامادە نەکردوون، بۆیە یەکێکیان بەوی تریانی ووت: تـۆ سـەیری بکـە بـە شێوەیەکی واخەوتووە بەوێنەی خەوی ماڵەوە "واتە بـێ خـەم خـەوتووە" جا ئەوە بوو لە خەو هـەڵیان ساندوو پێیـان ووت: بـچۆ بـۆلای پێغەمبـەرو (ﷺ) پێی بڵێ (أبوبكر و عمر) (خوایـان لـێ ڕازی بێـت) سـەلامت لێدەکـەن و داوای خواردنێکـت لـێ دەکـەن، جـا لـەم کاتـەدا پێغەمبــەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: نانیـان خـواردووە نایانـەوێت، ئـەوانیش کـە گـوێ بیـستی ئـەم ووتەیە بوون ڕاچڵەکین و چوون بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتیان: ئـەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە ناردمان بۆ لای تۆ بـۆ خـواردن کەچـی تـۆ بـەم شێوەیە وەڵامت داوەتەوە، ئایا ئێمە چی شتێکمان خواردووەو بەچی تێـر بووینە؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بە گۆشتی براکـەتان تێـر بوونـە، سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە گۆشتی براکەتان دەبینم لە نێوان ددانەکانتانــدا، ئینجــا فـــەرموویان: ئـــەی پێغەمبـــەری خـــوا (ﷺ) داوای لێخۆشبوونمان بۆ بکە، ئەویش (ﷺ) فەرمووی: با خزمەتکارەکـەتان داوای لێخۆشبوونتان بۆ بکات.

**دووەم:** هەندێ کەس دەڵێن: ئێمە باسی فلان کەس ناکەین لە پاشملە بۆ سوودو بەرژەوەندی خۆی نەبێت کە ئەو ئاگای لێ نییەو نایزانێت.

**بەرپەرچی ئەم جۆرە کەسانەش بەم شێوەیە دەدرێتەوە:**

١- هەر کردەوەیەك کە ئەنجام دەدرێت پێویستە شەرعی بێت، چونکە هیچ کەسێك لە سزای خوای گەورە رزگاری نابێت تەنها بە نییەتی باش بەڵکو دەبێت کردەوەکە بۆ خوابێت و هیچی تری تێکەڵ نەکرێت، چونکە هاوەڵ بڕیاردەرەکان بە گومانی خۆیان نیەتیان زۆر باش بوو کاتێك هاواریان دەکرد بۆ غەیری خوا، وەدەیان ووت: ئێمە نایان پەرستین بەڵکو دەمانەوێت لە خوا نزیکمان بکاتەوە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى ﴿٣﴾﴾ (الزمر:٣).

واتە: ئەوانەی لە هاوەڵ بڕیاردەرەکان جگە لە خوای گەورە ئەولیاو خۆشەویستیان دانابوو دەیان ووت: ئێمە نایان پەرستین بەڵکو بۆیە هاواریان بۆ دەکەین بۆ ئەوەی لە خوامان نزیك بکەنەوە.

بۆیە براو خوشکی بەڕێزم.... ئەگەر بەوردی سەرنجێکی کورت بدەیت لە ئایەتی ﴿إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾ سوودیان پێ ناگەیەنێت، بۆیە کە

تۆش باسی کەسێك دەکەیت و دەڵێیت من بۆ سوودو قازانج باسی دەکەم باس کردنی شتێك کە پێشی ناخۆش بێت ئەوە دەبێتە(غەیبەت).

٢- برای بەڕێزم .... ئەگەر تۆ دەڵێیت: من نییەتم باشەو بۆ بەر ژەوەندی ئەومە، ئەوکات دەبێت کردەوەکەشت باش و دروست بێت، کە ئەمەش لەوەدا دەردەکەوێت کە تۆ نابێت لە پاش ملە باسی ئەو بکەیت، بە ڵکو بەرەو ڕووی خۆی و بە شێوەیەکی نەرم و نیان و لە سەر خۆ ئامۆژگاری بکە، وە فێری بکەو تێی بگەیەنە کە ئەو کارە باشەو ئەو کارەش خراپە، بۆیە ناشبێت بێزاربیت لە ئامۆژگاری، چونکە جاری وا هەیە چەند جارێك پێویستی بەو جۆرە ئامۆژگاریانە هەیە.

جا براکەم ئەی خوشکە بەڕێزەکەم (تکایە هەوڵ بدە بەوێنەی مێش هەنگ بیت بەسەر گوڵی جوان و شوێنی پاکەوە بنیشیتەوەو شتی پاك و جوانیش بگوێزیتەوە بۆخەڵکی، ئامان نەکەی بەوێنەی مێش و مەگەز بیت بە شوێنی پیسەوە بنیشیتەوەو شتی پیسیش بگوێزیتەوە) بۆیە بەردەوامبە لە سەر ئامۆژگاریەکەت ئەگەر هەر زانیت سوودی نەبوو ئەوە کەسێکی تر ڕاسپێرە بائامۆژگاری بکات.

## هۆكارەكانی غەییەت كردن و چارەسەركردنی غەییەت

**یەكەم:** دامركاندنەوەی ڕق و كینە: ئەمەش لە كاتێكدایە كە كەسێك یان هاوڕێیەكت شتێكی بەرامبەرت كردووەو ڕقی هەستاندویت، بۆیە هەركات كە توشی ئەو حاڵەتە بوویت یان باس كرا یەكسەر هەڵدەكوتیتە سەر هاوڕێكەت و تێر غەییەتی دەكەیت، وەك تۆڵە سەندنەوەیەك، جا بۆچارەسەر كردنی ئەم حاڵەتەش بگەڕێوە بۆ ئەم ئایەتەی خوارەوە: ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣٤﴾ (آل عمران:١٣٣-١٣٤).

واتە: هەوڵ بدەن و پێشبڕكێ بكەن بۆ لێخۆشبوونی خوایی و بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە و میهرەبان، وە بۆ بەهەشتێك كە پانایيەكەی بە ئەندازەی ئاسمانەكان و زەویە، وە ئامادە كراوە بۆ كەسانێك كە لە خوا دەترسن و پارێزگارن وە ئەو كەسانەی كە لە ماڵەكانیان دەبەخشن و لە كاتی بوون و نەبوونی و خۆشی وناخۆشیدا، وە ئەو كەسانەش كە ڕق و كینەی خۆیان دەخۆنەوەو لێبوردەن بەرامبەر بە خەڵكی وە خوای گەورەش چاكە كارانی خۆش دەوێت .

جا بەڕێزم ...خواردنەوەی ڕق و کینەو غەیبەت نەکردنی ئەو کەسەی کە خراپەی بەرامبەرت کــــردووە، یاخــود تووڕەی کــــردووی نیشانەی خۆپارێزی و چوونە بەهەشتی خوایـــە. هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت: ((مَنْ كَظَمَ غَيْظًا "وَهُوَ قَادِرٌ عَلَى أَنْ يُنْفِذَهُ" دَعَاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى رُءُوسِ الْخَلَائِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُخَيِّرَهُ اللَّهُ مِنَ الْحُورِ مَـــا شَـــــاءَ)) [١].

واتە: هەر کەسێك ڕق وکینەی خۆی بخواتەوە لە کاتێکدا توانای هەیە هەقی خۆی بکاتەوە لەبەرامبەرەکەی، ئەوە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لە سەرووی هەموو خەڵکەوە بانگی لێ دەکات و سەرپشکی دەکات لە هەڵبژاردنی کام حۆرییەی کە ئارەزووی دەکات و پێی خۆشە.

**دووەم**: دڵ نەشکاندن و ڕازی کردنی هاوڕێیان و ئەو کەسانەی کە لە مەجلیسیان دانیشتوویت: کاتێك دەبینیت هاوڕێکانت باسی خەڵکی دەکەن و غەیبەتیان دەکەن تۆش دەتەوێت ڕێگریان لێ بکەیت و نەهێڵی غەیبەت بکەن، بەڵام ئەوان دەڵێن: بەم شێوەیە قورسی مەکە لەسەرمان لێشت دوور دەکەونەوە و تۆش لەبەر خاتری هاوڕێیەتی کردن و دانیشتن لەگەڵیاندا ڕازی دەبیت و بەڵکو هەندێك یارمەتیشیان دەدەیت لەسەر

[١] أخرجه أبو داود في سننه (٤٧٧٩) والترمذي وإبن ماجه وحسنه لغيره ، الشيخ الالباني في صحيح الترغيب والترهيب ( ٢٧٥٣)

غەیبـەت کردنـی موسـڵمان، جـا چارەسـەری ئەمـەش بەخوێندنـەوەو یادکرنەوەی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە دەفـەرمووێت: ((وَمَنِ الْتَمَسَ رِضَاءَ النَّاسِ بِسَخَطِ اللَّهِ وَكَلَهُ اللَّهُ إِلَى النَّاسِ))[1].

واتە: هەرکەسێك بیەوێت کە خەڵکی لە خۆی ڕازی بکات بە توڕەبوونی خوا، ئەوە خوای گەورە دەیداتە دەست خەڵکی.

دەی موسوڵمانە بەڕێزەکان کاتێك دەتـەوێت هاوڕێکانـت ڕازی بکـەیت بەوەی کە غەیبەت بکەن کـە خـوا پێـی ناخۆشـە ئـەو کاتـە خـوای گـەورە دەتداتە دەست خەڵکی.

**سێیەم**: بەرز کردنەوەی خۆت بەسەر خەڵکیدا: ئەویش بەشکاندنەوەو بەکەم زانینی کەسانی تر، وەك ئەوەی بڵێـی: جـا فلاّنـە کـەس چییە؟ بـە خـوا هـیچ نازانێـت یـان بـاش تێـی ناگـات، مەبەسـتت بەمـە تـەنها کـەم کردنەوەیـە لـە پلـە و پایـەی بەرامبـەر وەواش پیـشان بـدەیت کـە خـۆت زیاتری لەو.

بۆ چارەسەرکردنی ئەم حاڵەتەش تەنها بەوە دەبێـت کـە بـیرو بـاوەڕت وابێت ئەوەی لای خوای گەورەیە زۆر باشـترو چـاکترە، وەئـەم دونیایـەش

---

[1] جزء من حديث أخرجه الترمذي وغيره ، وهو صحيح لغيره ، الترغيب والترهيب (٢٢٥٠)،انظر تخريج الطحاوية (٢٧٨).

لای خوای گەورە بەئەندازەی یەك باڵە مێشوولە بەهاو قیمەتی نییە، وە کەسی غەیبەت کراویش لای خوای گەورە پێ دەچێت ڕێزی زۆرتر بێت لەتۆ! وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموویێت: ((رب أشعث مدفوع بالأبواب، لو أقسم على الله لأبره)) [1].

واتە: جاری واهەیە پیاوێکی سەرو قژ ئاڵۆزکاوو تەپوو تۆزاوی و دەرکراو لە دەرگا خەڵکی بەکەم تەماشای دەکەن و ڕێزی لێ ناگرن ئەگەر سوێند بخوات و بڵێت خوایە دەبێت ئەو شتەم بۆ ئەنجام بدەیت خوای گەورەش سوێندەکەی ناخات و شتەکەی بۆ جێ بەجێ دەکات.

**چوارەم:** یاری و گاڵتەکردن: جاری واهەیە لە دانیشتنێکدا دەبینیت پیاوی وا هەیە بە ڕاست و چەپی خۆیدا چاك و خراپی خەڵك باس دەکات و لەپاشملە لێیان دەدوێت ئەمەش لەشێوەی گاڵتە جارپیدا بۆئەوەی خەڵکی پێی پێ بکەنن و بڵێن بەخوا گاڵتە چییە؟! (بەڵێ لە سەردەم و ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا غەیبەت بەرگێکی جوانتری بە بەرداکراوەو لەشێوەی شانۆگەری و لاسایی کردنەوەی خەڵکیدا پێشکەش دەکرێت و بەشێوەی هەزەلی وپێکەنیناویش پاشان لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن و کەناڵەکانەوە ئاراستەی خەڵك دەکرێت کە ئەمەش جۆرێکە لە غەیبەت کردن بە کردەوە) جا بۆچارەسەری ئەم حاڵەتە ئەم فەرموودەیە

---

[1] صحيح مسلم ( ٢٦٢٢ ).

بەبیرخۆت بهێنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: ((وَيْلٌ لِلَّذِي يُحَـدِّثُ بِالْحَدِيثِ لِيُضْحِكَ بِهِ الْقَوْمَ فَيَكْذِبُ وَيْلٌ لَهُ وَيْلٌ لَهُ)) [1].

واتە: وەیل کە شیوێکە لە شیوەکانی دۆزەخ بۆ ئەو کەسەی کە قسە دەکات بۆ خەڵکی وباسی خەڵکیان بۆ دەگێڕێتەوە بەدرۆ بەس بۆ ئەوەی کە دانیشتوان پێی پێبکەنن، وەیل بۆ ئەو کەسە، وەیل بۆ ئەو کەسە.

بەڕاستی زۆر ترسناکە ئازیزانم بۆیە خۆشەویستمان (ﷺ) بەوشێوەیە ووشەی وەیل چەند جارێك دووبارە دەکاتەوە.

**پێنجەم:** هۆکارێکی تر کە مرۆڤ توشی غەیبەت دەکات بریتیە لە حەسودی: ئەم جۆرەش لە کاتێکدا ڕوودەدات کە کەسێك بە باشە باس دەکرێت لەناو خەڵکیداو ئەو کەسەش خۆشەویستە لەلای خەڵکی و ڕێزی خۆی هەیە، لەو کاتەدا کەسی حەسوود کە بیستی بەم جۆرە مەدحی ئەو کەسە دەکرێت یەکسەر توشی حەساسیەت دەبێت و ڕاستەوخۆ پەنا دەباتە بەر غەیبەت کردنی، چونکە هیچ ڕێگەیەکی تر شك نابات، جابرای خۆم خوشکی بەڕێز.... بێگومان کەسی حەسوود حەز بە خێرو خۆشی بەرامبەری ناکات، بەتایبەتی کەسانی نەفام و نەزان، هەرگیز حەز بە

---

[1] أخرجه الترمذي وأبو داود وغيرهما، وحسنه الشيخ الالباني في (صحيح الترغيب والترهيب) (٢٩٤٤) وغاية المرام ( ٣٧٦).

ڕێزداری و پلە بەرزی زانایان ناکەن و هەمیشە دەیانەوێت لە ڕێگەی غەیبەتەوە داخی خۆیانیان پێ بڕێژن، بۆیە پێویستە زۆر باش بزانرێت لە کاتێکدا کە غەیبەتی زانایان دەکرێت ئەوە لە پلەو پایەی زانایان کەم نابێتەوە بەڵکو تەنها ڕوو ڕەشی بۆ کەسی غەیبەتکار دەمێنێتەوەو هیچی تر.

سەرهەڵدانی غەیبەتیش لە ڕێگای حەسودییەوە زیاتر لە نێوان ئەو چینانەدا ڕوو دەدات کە هاوپیشەن، چونکە هەندێك جار بینینی نازو نیعمەت بەسەر کەسانی هاوپیشەی خۆتەوە دەبێتە هۆی ڕق و کینەو پاشان حەسودی و پاشان غەیبەت کردنی.

**شەشەم:** دەست بەتاڵی و بێ کاری و هەست کردن بە بێتاقەتی ئەم مرۆڤە وا لێدەکات کە ڕۆژانەو بەردەوام هەر خەریکی غەیبەت و غەیبەتکاری بێت، وە خوی تەواوی پێوە بگرێت و باسی خەڵکی بکات، جا بۆ چارەسەری ئەم جۆرەش: پێویستە هەمیشە مرۆڤ خۆی سەر قاڵ بکات بە یادی خواو گوێڕایەڵی پەروەردگاریەوە بەردەوام بێت لەسەر وەرگرتنی زانست و خۆ خەریك کردن بە کاری چاکەوەو دووربکەوێتەوە لە هەموو کارێکی خراپ و بەد. هەر وەك خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرموێت: ((لاَ تَزُولُ قَدَمَا ابْنِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ عِنْدِ رَبِّهِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ خَمْسٍ عَنْ

عُمْرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ وَعَنْ شَبَابِهِ فِيمَا أَبْلاَهُ وَمَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَ أَنْفَقَهُ وَمَاذَا عَمِلَ فِيمَا عَلِمَ)) [1].

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا دوو پێی هیچ کەسێك لەنەوەی ئادەم ناجوڵێ تا پرسیاری دەربارەی پێنج شت لێ نەکرێت: تەمەنەکەی لە چیا سەرف کردووە؟ وە گەنجێتیەکەی چۆن بەسەری بردووە؟ لە خواپەرستیدا یاخود لە کاری خراپ و گوێ نەدان بە فەرمانەکانی خوا؟ وە لە ماڵەکەی چۆن پەیدای کردووەو لە چیشدا سەرفی کردووە؟ وە پرسیاری لێ دەکرێت دەربارەی زانستەکەی کەچی سودێکی پێ گەیاندووەو ئایا چۆن گەیاندوویەتی (هەتا چی سنوورێك کردەوەی بە زانیاریەکەی کردوە)؟ ...جا بەڕاستی ژیان پێکهاتووە لەم چەند پرسیارەو بەم قۆناغانەشدا تێدەپەڕێت، کەواتە با هەوڵ بدەین ئەم پرسیارانە هەر لێرە پێش ئەوەی ڕۆژێك بێت بە خزمەتی بگەین و پرسیارمان لێ بکرێت وەڵامی بۆ ئامادە بکەین و خۆمانی پێ بڕازێنینەوە.

**حەوتەم**: جاری وا هەیە مرۆڤ بۆ نزیك بوونەوەی لە کەسانی خاوەن پلەو پرۆژەو ئیش و کارو دەسەڵاتداران، هەڵدەستێت بە باس کردن و غەیبەت کردنی کرێکارو کار مەندان و کەسانی ترو شکاندنەوەیان بەمەبەستی گەیشتن بەو شوێنە یان بەو کارە، بەڵا مرۆڤ پێویستە

---

[1] صحيح سنن الترمذي ( ١٩٦٩ ) وأنظر سلسلة الصحيحة ( ٩٤٦)

هەمیشە بیر لە دەسەلاتی خواو فەرموودەکانی بکاتەوە، ئەوسا بۆی دەردەکەوێت کە ڕزق و ڕۆزی تەنها لای خوایەو هەر خوای گەورەشە کە دەفەرمووێت: ﴿ نَحۡنُ قَسَمۡنَا بَيۡنَهُم مَّعِيشَتَهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَرَفَعۡنَا بَعۡضَهُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ لِّيَتَّخِذَ بَعۡضُهُم بَعۡضٗا سُخۡرِيّٗاۗ ﴾ (الزخرف:٣٢).

واتە: ئێمە لەنێوانیاندا بژێوی ژیانمان دابەش کردووە، لە دونیادا هەندێ کەس دەوڵەمەندو هەندێ کەسیش هەژار، وە هەندێکیانمان چەند پلە بەرز کردۆتەوە بەسەر هەندێکی تریاندا، تا هەندێکیان ئیش و کار بە هەندێکیان بکەن.

موسڵمانی خۆشەویست هۆکاری تریش زۆرن کە غەیبەتی پێوە دەکرێت لەوانە: کاتێك کەسێك کارێك ئەنجام دەدات ونهێنییە لای تۆ بەلام لە شوێنێك باس دەکرێت و تۆش یەکسەر وا دەزانی ئەو کارە فلان کەس کردوویەتی ناوی دەبەیت و ئاشکرای دەکەی، ئەوە دەبێتە غەیبەتی، یان جاری واهەیە کەسێك دەستی ناڕوات تۆش خێرت پێ کردووەو یارمەتیت داوە لەو کاتەدا لای خەڵکی باسی دەکەیت و دەکەویتە شکاندنەوەی و غەیبەتی دەکەیت.

## ترسناکی غەیبەت لە ڕوانگەی فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ)

**یەکەم:** هاوەڵی بەڕێز أبوبکرة (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ((أَنَّ رَسولَ الله (ﷺ) قال في خطبته في حجة الوداع: إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ بَيْنَكُمْ حَرَامٌ عَلَيْكُمْ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، وفِي بَلَدِكُمْ هَذَا، لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ)) [1].

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە حەجی ماڵ ئاواییدا ووتارێکی بۆمان خوێندەوە و ئامۆژگاری کردین و فەرمووی: ئەی موسوڵمانان ئاگادارین و باش بزانن کەخوێنتان و ماڵتان و ناموس و غەیبەت و باس کردنی یەکتری حەرامە لە سەرتان، هەروەکو حەرامێتی کوشتارو ئاشووب نانەوە لەم ڕۆژە پیرۆزەدا، وە لەم مانگە پیرۆزەدا، وە لەم شارە پیرۆزەدا کە شاری مەککەیە، وەهەر کەسیش لەم شوێنەیە ئامادەیەو گوێ بیستی ئەم قسانەیە، بابیگەیەنێت بەو کەسەی کە نەهاتووەو ئامادەنییە.

موسوڵمانی خۆشەویست لێرەوە باش بزانەو سەرنج بدە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن ئاگادارمان دەکاتەوە لە حەرامێتی خوێن ڕشتن ونانەوەی ئاشوب و دووبەرەکی، هەر واش ئاگادارمان دەکاتەوە لە باس کردن و غەیبەت کردنی موسڵمانان بە حەرامی.

---

[1] صحيح البخاري ( ٦٧) وصحيح مسلم (١٦٧٩).

**دووەم:** هاوەڵی بەڕێز براء کوڕی عازب (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((الرِّبا إثنان وَسَبعونَ باباً، أدناها مثلُ إتيانِ الرَّجُلِ أُمَّهُ، وَإنَّ أربى الرِّبا إستِطالَةُ الرَّجل في عِرضِ أخيهِ))[1].

واتە: ڕیبا (سوو خواردن) حەفتاو دوو بەشە: کەمترین و سووکترین بەشیان وەکو ئەوە وایە کە پیاو (زینا) لەگەڵ دایکی خۆیدا ئەنجام بدات، وەگەورەترین ڕیباش ئەوەیە کە کەسێك باسی ناموس و شەرەفی براکەی بکات و لە پاش ملە باسی بکات یان بوهتانی بۆ هەڵببەستێ، جا مەبەستیش لە باس کردنی ناموس و شەرەفی خەڵکی و غەیبەت کردنیان، کە گەورەترین ڕیبایە ئەوە نییە کە حەددێکی شەرعی یان جەڵدەی لێ بدرێت، نا بەڵکو جۆرێکە لە تاوانە گەورەکان، هەروەك زینا کردنە کە تاوانێکی گەورەیە، پاك و بێگەردی تەنها بۆ خوایە، کوان خاوەن ژیرەکان؟ لەبەرامبەر ئەنجامدانی ئەم تاوانەدا، ألله أكبر کوا ئەو باوەڕەی کە دڵەکان ڕۆشن دەکاتەوە؟ جا سبحان الله خواردنی ڕیبا چەند حەرامەو چەند تاوانێکی گەورەیە؟ تا خوای گەورە بە شێوەیەکی وا باسی دەکات و هەرەشەو جەنگ ڕادەگەیەنێت لەگەڵ ئەو کەسەی کە دەیخوات و مامەڵەی پێوە دەکات، یان وا باسی دەکات بە ئەندازەی زینا کردن لەگەڵ دایکی خۆیدا (پەنا بەخوا) جا لەمەش خراپتر باس کردنی نامووس و شەرەفی خەڵکی یە.

---

[1] صحيح الترغيب والترهيب (١٨٥٧) السلسلة الصحيحة (١٨٧١)

دەئیتر با کەسانی (غەیبەت)چی لەدوای بیستنی ئەم بەڵگانەوە زمان درێژ بکەن چۆن دەیانەوێت؟ با عەیبەو عاری موسڵمان هەڵماڵن چۆن دەیانەوێت؟ یان چۆن پێیان خۆشە، یان با جاسوسی لە سەر موسوڵمانان بکەنە پیشەی خۆیان و بەردەوام بن .....

بەڵام ئایا لە سزای خوایی و تۆڵەی بە ئێشی خوای گەورە ڕزگاریان دەبێت؟ نەخێر... ئەی بۆ کوێ دەچن؟ ئایا نازانن ڕۆژگارێك دادێت کە لێپرسینەوەی خوایی هەیە و مردن و ناوگۆڕو ساحەی مەحشەرو حوکمی خوایی لە پێشە؟؟ جا توخوا پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) کاتێك بە دایکمان خاتوو عائیشەی (خوالێی ڕازی بێت) فەرموو: ((لَقَد قُلتِ كَلِمَةً لَو مُزِجَت بِماءِ البَحرِ لَمَزَجَتهُ)) واتە: ووشەیەکت ووت ئەی عائیشە ئەگەر تێکەڵ بکرێت بە ئاوی دەریا ئەوا ڕەنگ و تام وبۆنی ئەو ئاوە دەگۆڕێت.

تەنها لەسەر ووشەیەکی کەم ئەی ئایا دەبێت حاڵی ئەوانە چۆن بێت کە بەردەوام "تووتی ئاسایی" هەر دەیڵێن و هەر دەیڵێنەوە و بەردەوامن لە باس کردن و غەیبەتی خەڵکی؟ یان دەبێت چی دەریایەك خۆی بۆ ئەم تاوانە بگرێت و بۆ گەن نەکات؟ بۆیە وەك ئامۆژگاریەك ئەی خوشك و برای خۆم.... نەکەی خۆت بخەیتە بەر سزای خوایی بۆ تەنها چەند ساتێکی کەمی ئەم دونیا بێ نرخەی کە زۆر کەسانی بە هیلاکا بردوە. خۆت بپارێزە پێش ئەوەی فەرمووی دۆزەخت لێ بکرێت......

**سێیەم:** هاوەڵی بەڕێز عَمْرو کوڕی شُـعَیب لە باوکییەوە ئەویش لە باپیرییەوە (خوا لێیان ڕازی بێت دەیگێڕێتەوە کە: ((أنَّهُم ذَكَـرُوا عبـد رَسُولِ الله (ﷺ) رَجُلاً فقالُوا: ((لا يَأكُلُ حَتّى يُطْعَمَ وَلا يَرحَلُ حَتّى يُرحـل لَهُ، فقالَ رَسولُ الله (ﷺ) اغْتَبْتُمُوه: فَقالُوا: يا رَسولَ الله (ﷺ) إنَّما حَدَّثْنا بما فِيه، قالَ: ((حَسْبُكَ إذا ذَكَرْتَ أخاكَ بِما فِيه)) [1]

واتە: لە مەجلیسی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) باسی پیاوێکیان کردوو وتیان: ناتوانێت بخوات تاکو دەرخواردی نەدەی، وە ناتوانێت وڵاخەکەی بۆ لێ بخوڕدرێت تا بۆی لێ نەخوڕیت (واتە: بێدەسەڵاتە) جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: غەیبەتتان کرد، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی شتێکمان کرد کەتیایدا بوو، ئەویش فەرمووی: بەسە باس کردنی براکەت کە ببێتە غەیبەت، با ئەو ڕەوشتەشی تێدابێت، گەر پێی ناخۆش بێت.

**کەواتە برایانی بەڕێزم.... خوشکانی ئازیز...** بەسەو هەتا کەی غەیبەتی براو خوشکی موسوڵمانت دەکەیت؟ هەتاکەی دوو زمانی و باسی موسوڵمان؟؟!! دەکەواتە با هەر یەك لە ئێمە بیرێك لە حاڵی خۆی بکاتەوە، بزانێت ئایا کێ هەیە لە ئێمە بێ هەڵەو کەم و کوڕی بێت؟؟ ئەی

---

[1] أخرجه الاصبهاني، وحسنه لغيره الشيخ الالباني في صحيح الترغيب والترهيب (٢٨٣٦).

باشە کێ لە ئێمە لە شەیتان ئەمینە و پارێزراوە؟؟ بشزانە سوێند بە خوا لە دەرگای هەرماڵێك بدەیت ئەوە هەر زۆر زوو لە دەرگاکەت دەدرێتەوە.

## غەیبەتی زانایان و پیاو چاکان

بزانە برای موسوڵمان کە باس کردن و غەیبەت کردنی زانایان وپیاوچاکان وەکو غەیبەت کردنی کەسانی سادە و نەشارەزا نییە، چونکە گەر تۆ غەیبەتی خەڵکی ئاسایی و سادە بکەیت تەنها خراپەت بەرامبەر خودی ئەو کەسە کردووە، بەڵام گەر تۆ باسی زانایان وپیاوچاکان بکەیت، ئەوە خراپەت بەرامبەر خۆی کردووە وەك سەرجەم موسوڵمانی تر، وە خراپەت بەرامبەر ئەو عیلم وزانیاری و شەرعە کردووە کە لایەتی و شارەزاییە تێیدا، بەڵی کاتێك باسی زانایەکی شارەزا لە شەرع دەکەیت بە خراپە و غەیبەتی دەکەیت (کە پێ دەچێت واش نەبێت) لە بەر چاوی خەڵکی دەخەیت و سووکی دەکەیت، ئەو خەڵکەش بە چاوی رێزەوە سەیری ناکەن و قسەی لێ وەرناگرن، بەڵکو بگرە بۆ پرسیارو وەرگرتنی فەتواش ناگەرێنەوە لای، وە هەندێ جار ئەوەشی خەڵکی گوێی لێدەگرێت و پرسیاری لێ دەکات گومانی تێیدایە، چونکە تۆی موسوڵمان بە خراپە باست کردووە و غەیبەتت کردووە، ئەو کاتە تاوانێکی گەورەت بەرامبەر شەریعەت ئەنجام داوە.

ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە: زانایان بۆچوونی ڕاست و هەڵەشیان هەیە وە هیچ کەس لە وان و لە ئێمەش بێ کەم و کوڕی و بێ هەڵەو بێ تاوان نییە، بۆیە نابێت و دروست نییە ئێمە هەڵەی زانایان بکەینە ڕێخۆش کەرێك بۆ غەیبەت کردن و کەم کردنەوەی زانیاری و شان و شەوکەتیان، لەبەرئەوەی لە سروشتی هەموو مرۆڤێکە کە کەم و کوڕی هەڵەی هەبێت، بۆیە پێویستە لە سەرمان هەرکاتێك هەڵەیەکمان لە زانایەك یان بانگەوازکارێك یان پێش نوێژو ووتار خوێنی مزگەوتێك بینی نەکەوینە باس کردن و غەیبەت کردنیان، بەڵکو پەیوەندی پێوە بکەین تا ئەو هەڵەیەمان بۆ ڕوون ببێتەوە، چونکە جاری وا هەیە کاتێك کەسێك شتێکت بۆ دەگێڕێتەوە لە فلان کەسەوە بەهەڵە بۆت دەگێڕێتەوە، یان لەو قسەیەی کە بۆتۆی دەگێڕێتەوە جوان لێی تێنەگەیشتووە، یان جاری واهەیە ئەو کەسەی قسەکەت بۆدێنێت نیەتی خراپەو مەبەستی شکاندنەوەو ناشرین کردنی ئەو زاناو مامۆستاو وتار بێژەیە.

بۆیە داواکارم لە گەنجانی تازە پێگەیشتوو و فێرخوازانی زانستی شەرعی لە خوای گەورە بترسن و باس کردنی زانایان نەکەنە کاغەزێکی سپی چۆن بیانەوێت هەڵی بدەنەوە لەسەری بنوسن، بەهەوەسی خۆیان باسی ئەم زاناو ئەو زانا بکەن و قسەیان لەسەر بکەن، توخوا گەر غەیبەتی خەڵکی تاوانێکی گەورە بێت، ئەبێت غەیبەت کردنی زانایان چەندێك گەورەترو تاوانتربێت؟

موسڵمان خۆشەویست بە گشتی غەیبەت کردنی زانایان چەندین ئاکامی خراپی لێدەکەوێتەوە **لەوانە:**

١. غەیبەت کردن و ناشرین کردنی زانایان دەبێتە وەرنەگرتنی ئەو حەق و ڕاستیەی کە دەیڵێن، لەکەدارکردن و غەیبەت کردنی زانایان وەك لەکەدارکردنی کەسێکی ئاسایی نییە، بەڵکو کاریگەری زیاترو زۆرترە وە ناشرین کردن و لەکەدارکردنی ئەو حەق و ڕاستیەیە کە لایەتی.

٢ زانایان میرات گری پێغەمبەری خوان (ﷺ) بۆیە لەکەدار کردن و غەیبەت کردنیان لەکەدار کردن و بێ ڕێزییە بەرامبەر بەو زانیارییەی کە لە پێغەمبەری خواوە وەریان گرتووە، وە ئازاردانی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) هەروەك ابن عباس (ﷺ) فەرمویەتی: ((مَن آذَى فَقِيهاً فَقَد آذَى رَسولَ اللهِ (ﷺ)، وَمَن آذَى رَسولَ اللهِ (ﷺ) فَقَد آذى اللهَ عَزَّ وَجَلَّ)) [1]

واتە: هەرکەسێك ئازاری زانایەك بدات ئەوە ئازاری پێغەمبەری خوای (ﷺ)داوە، وەهەرکەسێك ئازاری پێغەمبەری خوا(ﷺ) بدات ئەوە ئازاری خوا گەورەی داوە، کارێکی وای کردووە کە خوای پەروەردگار پێی ڕازی نییە و پێی ناخۆشە.

٣. غەیبەت کردن و باس کرنی زانایان بە خراپە دەبێتە هۆی دوور کەوتنەوەی فێرخوازانی زانستی شەریعەت لێیان، بۆیە لەو کاتەدا

---

[1] الترغيب في فضائل الأعمال وثواب ذلك ٣١٦/١ ، الفقيه والمتفقه للبغدادي ١٤٠/١.

قوتابیانی زانست خواز بەردەوام دەبەن لەسەر ڕێگەی خۆیان بێ ڕێنمونی کەرێکی دڵسۆزو خەمخۆر، وە تووشی چەندەها هەڵەو پێ هەڵخلیسکان دەبن، بۆ؟ لەبەر ئەوەی کەسانێك بە نەشارەزایی و ڕق و کینەیان بەرامبەر بەزانایان هەڵدەکوتنە سەریان و لەکەداریان دەکەن و لەبەرچاوی خەڵکیان دەخەن، ئەوکاتە خەڵکی وەکو ڕانە مەڕی بێ شوان پەرت و بڵاو دەبن و چەندەها بۆچوونی جیاواز دروست دەبێت، هەمووی بە قسەو لە خوانەترسانی کەسانێکی سەر گەرم و تازە پێگەیشتوو، کە هەندێك جار قسەی وا دەکات و فەتوای وا دەدات زانایان ناوێرن بەو بوێرییە فەتوا بدەن، کەسانێك سوێند بە خوای گەورە پێ دەچێت شارەزاییان نەبێت لە مانای (لا إله إلاّ الله) کە بنەڕەت و بنچینەی ئیمانە، وە شارەزاییان نەبێت لە زمانی عەرەبی کە گەورەترین هۆکارە بۆ تێگەیشتن لە قورئان و سوننەت بە شێوەی ڕاست و دروست کەچی هەڵدەکوتنە سەر زانایان و لە خواترسان و غەیبەتیان دەکەن و لەکەداریان دەکەن ، زانایەك کە دەیان ساڵ بگرە زیاتر تێکۆشاوەو شەو نخونی و ماندوو بوونی بینیوە، تا بگاتەڕادەیەك خەمخۆری تۆ بێت و لە گەورەیی خوای گەورە و سزای دۆزەخ ئاگادارت بکاتەوە، کاتێك غەیبەتی دەکەیت، ئایا تۆ شارەزا تری لەو؟ نا، سوێند بە خوای گەورە، تۆ لەو خەمخۆرتری بۆ موسوڵمانان؟ بە گومانی خۆت بەڵێ، بەڵام سوێند بە خوای گەورە نەخێر، بۆیە موسوڵمانی خۆشەویست گۆشتی زانایان مەخۆن (غەیبەتیان مەکەن)،

چونکە (لحوم العلماء مسمومة) واتە: خواردنی گۆشتی زانایـان ژەهراوییـە، بۆیە هەرکەسێك بەر ببێتە گیان زانایـانی ڕاستەقینەو غەیبـەتیان بکـات و تانەو تەشەرەیان لێ بدات با بێ گومان بێـت وەکـو کەسـێکە خـۆی ژەهـر خواردوو کردوەو خۆی لە ناو بردووە.

**بـەڵام لێـرەدا پرسـیارێك دێتـە پێـشەوەو دەکرێـت: ئەگـەر زانایـەك هەڵەیەکی کردبوو یان زیاتر ئایا باس کرنی غەیبەتە یان نا؟**

**وەڵام:** موسوڵمانی خۆشەویست خوای گەورە فەرمانی پێ کـردووین کـە قسەی هیچ کەسێك نەخەینە پێش قسەی خـواو پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ)، هـەر وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ۝١ ﴾ (الحجرات: ١).

واتە: ئەی ئیمانداران قسەی هـیچ کەسـێك مەخەنـە پـێش قـسەی خـواو پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ)، تـەقوای خواتـان هـەبێت و لـە خـوای گـەورە بترسن، خوای گەورە.بیسەرو زانایە.

دروست نییە بە هیچ شێوەیەك بۆچوون و قـسەی هـیچ کەسـێك بخەیتـە پـێش قـسەی خـواو پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) ئەگـەر خـۆت بـە ئیمانـدار ئەزانیت، بۆیە کاتێك فەتوای زانایەکت بینی پێچەوانەی فـەرمودەی خـوای گەورە و پێغەمبەری خوایە (ﷺ) وەری ناگریت و کـاری پێناکـەیت، بـەڵکو

لە هەمان کاتدا نەك غەیبەت نییە بەڵکو پێویست و واجبە کە خەڵکی ئاگادار بکەیتەوە لەو هەڵەیە بە لێزانی و لەسەرخۆیی، چونکە گەر هەر بڵێین فلان کەس ئاوها و ئاوها زاناو شارەزایەو چاو پۆشی لە هەڵەکانی بکرێت ئەو کاتە بەتەواوی شەرعی خوای گەورە دەگۆرێت، لە جیاتی یەکخوا پەرستی هاوەڵ بریاردان بۆ خوای گەورە بلاو دەبێتەوە، چونکە لەناو بەناو زانایان و مامۆستایان هەیە هاوارکردن بۆ جگە لە خوای گەورە بە دروست دەزانێت لە کاتێکدا گەورەترین تاوان و شیرکە، گەر لایەنی هەڵەی ئەو کەسانە ڕوون نەکرێتەوە ئەوە بێگومان خەڵکی بە هۆی بەناو زاناو مامۆستاوە شوێنیان دەکەون وسەریان لێ دەشێوێت، یان گەر لایەنی هەڵەی ئەو کەسانە ڕوون نەکرێتەوە ئەو کاتە لە شوێنی سوننەت بیدعەو شتی خراپ بلاو دەبێتەوە، بەڵی کەسانێك هەرچەندە پێیان بوترێت زاناو شارەزا گەر بنەمای جیا کرنەوەی سوننەتیان لە بیدعە نەبێت، ئەوە بێ گومان بیدعە دەکەن و خەڵکیش لە سوننەت دوور دەخەنەوەو لەسەر بیدعە پەروەردەیان دەکەن، بۆیە زانایەك ئیجتیهادی کردووەو حەقی نەپێکاوە تێیدا دەبێت هەڵەکەی ڕوون بکرێتەوە بە دڵسۆزی و ڕێز گرتنی تەواو لە زاناکە، بەلام کەسانی نەشارەزاو بیدعەچی پێویستە باس بکرێن و پەردە لە ڕووی بیدعەکانیان هەڵبماڵدرێت، تا دینی خوای گەورە بە پوخت و پاکی و دوور لە شتی پڕو پوچ لە ناو خەڵکیدا بلاو ببێتەوە، وە

کەسانێك بەنەزانی یان کەسانێك بە مەبەستی خراپیان نەتوانن سوننەتی پاك و پیرۆزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بگۆڕن.

٤. لەکەدارکردنی زانایان و غەیبەت کردنیان بێ نرخ کردنیانە لەبەر چاوی خەڵکی، وە نەمانی شان و شەوکەت و ڕێزیانە لە دڵیاندا، کە ئەمەش دوژمنانی ئیسلام دڵخۆش دەکات، هەر بۆیە لەزۆربەی وولاتە ئیسلامیەکاندا زانایان بێ ڕێزو بێ نرخ کراون، چونکە کەسانی نا شایستە زانایانیان بێ ڕێزو بێ نرخ کردووە لەبەر چاوی خەڵکی (خوای گەورە ئەو کەسانە زیاتر بێ ڕێزو بێ نرختر بکات کە دەیانەوێت سووکایەتی بە زانایان و پیاوچاکان و بانگەوازخوازان بکەن، آمین).

٥. هاتنەدی ئاواتەکانی دوژمن هەر هەمووی بە هۆی بێ ڕێز کردنی زانایان و غەیبەت کردنیانە.

بەڵام لێرەدا دەبێت ئاگاداری خاڵێك بین کە زانایان قسەیان لەسەر کردووە و موسوڵمانانیان لێ ئاگادار کردووەتەوە، ئەویش ئەوەیە کاتێك دەوترێت غەیبەت کردنی زانایان تاوانی زیاترە لە غەیبەتی کەسانی سادە، ئایا زانایان گەر هەڵەشیان هەبێت نابێت باسی هەڵەکانیان بکرێت؟ یان باس کردنی هەڵەکانیان پێویستە و دەبێت ڕوون بکرێتەوە؟

ئیمامی البَربَهاري (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمووێت: بزانە كە پێ هەڵخلیسكان و دەر چوون لە ڕێگای ڕاست بە دوو شێوەیە:

یەكەم: پیاوێك (زانایەك) ڕێگای ڕاستی هەڵە كردووە، لە كاتێكدا تەنها مەبەستی حەق بووە، لەم كاتەدا چەندێك ئەو زاناو پیاوچاكە هیچ مەبەستێكی نەبووە تەنها خێرو چاكە نەبێت، بۆیە نابێت شوێنی هەڵەكەی بكەوین، چونكە ئەو كەسەی شوێنی هەڵەی زانایان دەكەوێت و دەش زانێت هەڵەیە كەسێكی لە ناو چووە.

دووەم: كەسێك نكوڵی لە حەق و ڕاستی دەكات و پێچەوانەی زانایان و پیاو چاكانی لە خوا ترسی پێشینی خۆی دەجولێتەوە، ئەوە كەسێكی گومڕاو سەرلێشێواوەو سەر لە خەڵكیش دەشێوێنێت، شەیتانێكی لە ڕێ دەرچووی ئەم ئوممەتەیە، بۆیە هەركەسێك بیناسێ و شارەزای حاڵی بێت پێویستە خەڵكی لێ ئاگادار بكاتەوەو باسی حاڵی بكات بۆیان، تا خەڵكی نەكەونە بیدعەو سەر لێشێواویەكەیەو لە ناو بچن [1].

بزانە (ڕەحمەتی خوات لێبێت) ئیسلامەتی هیچ بەندەیەك تەواوو دروست نییە تا كەسێكی شوێن كەوتووی ڕاستەقینەی پێغەمبەر (ﷺ) نەبێت و ڕاستگۆو موسوڵمانێكی تەواو نەبێت، وە هەركەسێك گومانی وابێت شتێك

---

[1] شرح السنة للعلامة المحدث الإمام البربهاري (ص ٢).

ماوه له ئیسلامداو هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان نەگەیاندووین، ئەوە کەسێکە هاوەڵانی پێغەمبەری (ﷺ) بەدرۆ خستۆتەوە، بەسە بەو قسەیەی کە دەیکات ببێتە مایەی پارچە پارچەیی و تانەو تەشەنە دانی لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەو کەسەی کەوا دەڵێت کەسێکی گومڕاو سەرلێشێواوەو سەر لە خەڵکیش دەشێوێنێت، کارێکی هێناوەتە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە کە خۆی تێیدا نەبووە [1].

وە بڕوانەو سەیر بکە هەموو ئەو قسانەی کە دەیبیستیت لە کەسانی سەردەمی خۆت، پەلە مەکەو هیچ کارێك مەکە لە خۆتەوە، تا پرسیار دەکەیت و سەیر دەکەیت: ئەوەی کە دەوترێت و دەیبیستیت لە کەسانی سەردەمی خۆت، ئایا هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)، یان یەکێك لە زانایان وتویانە؟ ئەگەر شتێکت بەدی کرد لە بۆ چوون و قسەی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) و زانایاندا دەستی پێوە بگرەو لێی دەرمەچۆ، وە هیچ قسەو بۆ چوونێك مەدە بەسەر قسەکانیاندا، چونکە ئاگری دۆزەخ دەتگرێت [2].

---

[1] جامع بيان العلم لإبن عبدالبر (ص ١٨١٠).

[2] شرح السنة للعلامة المحدث الإمام البربهاري (ص ٢).

وە بزانە ئەوەی کە کۆمەڵی موسوڵمانانی لەسەر بنیات بنرێت تەنها هاوەڵانی پێغەمبەرن (ﷺ) کە ئەوان بە ڕاستی ئەهلی سوننەو جەماعە بوون، بۆیە هەرکەسێك دینیان لێوەرنەگرێت بێ گومان کەسێکی سەر لێشێواو بیدعەچییە ، وە هەموو بیدعەو تازە داهێنراوێك لە دیندا سەر لێشێواوییە، وە هەموو گومڕاو سەر لێشێواوێك لە ئاگری دۆزەخدایە، هەروەك ئیمامی عومەر (ﷺ) دەفەرموێت: هیچ کەسێك عوزری نییە تا شوێنی گومڕایی و سەرلێشێواوی بکەوێت وابزانێت ڕێنمونی و خێری تێدایە، هیچ کەسێك عوزری نییە تا واز لە سوننەت و ڕێنمونی بهێنێت و واگومان بەرێت کەسەرلێشێواوی تێدایە، هەموو کارێك ڕوون بۆتەوەو حوجەو بەڵگە جێگیر بووە، وە عوزر بۆ هیچ کەسێك نەماوە.

**پرسیارێك:** ئایا کاتێك باسی هەڵەی (بیدعەی) هەر کەسێك دەکرێت دەبێت باسی چاکەکانیشی بکرێت؟

**وەڵام:** برای موسوڵمان گەر بە وردی چاوی ڕاستگۆیی بڕوانیتە کتاب و نوسراوو فەتواکانی (إبن تیمیة) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) بۆت دەردەکەوێت کە شێخی ئیسلام (إبن تیمیة) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) کاتێك باسی هەر کۆمەڵێکی سەرلێشێواو دەرچوو لە ڕێگای ڕاستی کردبێت، نابینیت باسی عیلم و چاکەو لە خوا ترسیانی کردبێت، چونکە گەر باسی عیلم و چاکەیان بکرێت ئەو کات دەبێتە دەعوە کردن بۆیان، بەڵکو لە چەندین نوسراو

کتابیدا زۆر بە توندی ڕەددی ئەهلی بیدەع و سەرلێشێواوانی داوەتەوە، بۆیە زۆری لەسەریان نوسیوە، وەك لەم کتابانەیدا بەرچاوت دەکەوێت: (درأ تعارض العقل والنقل)، (بيان تلبيس الجهمية)، (منهاج السنة النبوية) کەوا زیاتر ڕەددی شیعەیە، (الحموية)، (الواسطية)، (التدمرية)، (التوسل والوسيلة)، (الرد على البكري)، (الرد على الأخنائي)، وە جگە لەمانەش کە جیهادی گەورەی (إبن تيمية) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) بریتی بووە لە ڕەددانەوەی ئەهلی بیدەع، لە گەڵ کردنی جیهاد بە دەست و لاشەی.

هەروەك دەفەرموێت: ئەو کەسەی ڕەددی ئەهلی بیدەع و سەرلێشێواوان دەداتەوە کەسێکی موجاهیدو تێکۆشەرە، هەتا (يحيى کوڕی يحيى) فەرموویەتی: پارێزگاری کردنی سوننەت و دیفاع کردن لێی گەلێك باشترە لە جیهاد [1]

وە هەروەها ئەگەر بڕوانیتە فەتوای گەورە زانایانی وەك (شێخ إبن باز، شێخ ئەلبانی، شێخ صالح الفوزان، شێخ عبدالعزيز المحمد السلمان) و زانایاتی تری شوێن کەوتووی مەنهەجی سەلەفی سالح، بۆت دەردەکەوێت کاتێك باسی بیدعەی کەسانی بیدعەچیان کردووە باسی عیلم و چاکەیانیان نەکردووە، چونکە باس کردنی چاکەکانیان بانگەواز کردنە بۆ

[1] نقض المنطق لشيخ الإسلام إبن تيمية (رحمه الله) ص١٢

بیدعەکەیان وە پێویست ناکات (منهج الموازنة) واتە: (واتا کاتێك باسی بیدعە و خراپەیان بکرێت باسی چاکەکانیشیان بکرێت) بەکاربهێنرێت [٢].

## زەرەروو زیانەکانی غەیبەت کردن

غەیبەت کردن تاوانەو بێ گومانیش تاوانەکان هەموویان خاوەنی زەرەروو زیانی تایبەتی خۆیانن لەوانەش:

**یەکەم: کەمکردنی چاکە:** واتە هەرکات غەیبەتت کرد ئەوە بزانە کە لە چاکەکانت کەم کراوەتەوەو لەتەرازووی ئەو دونیات هەڵدەگیرێت و دەدرێت بەکەسی غەیبەت کراو، هەروەك لەم فەرموودەیەدا ئاماژەی پێکراوە، هاوەڵی بەڕێز أبوهریرة (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((أَتَدْرُونَ مَا الْمُفْلِسُ؟ قالوا: المُفلسُ فينا مَن لا دِرهَمَ لَهُ وَلا مَتاع، فقال (ﷺ) :((إِنَّ الْمُفْلِسَ مِنْ أُمَّتِي يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِصَلَاةٍ وَصِيَامٍ وَزَكَاةٍ وَيَأْتِي قَدْ شَتَمَ هَذَا وَقَذَفَ هَذَا وَأَكَلَ مَالَ هَذَا وَسَفَكَ

---

[٢] بڕوانە پێشەکی کتابی (منهج أهل السنة والجماعة في نقد الرّجال والكتب والطوائف)، کە دانراوی شێخ ربيع بن هادي عمير المدخلي.

دَمَ هَذَا وَضَرَبَ هَذَا فَيُعْطَى هَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ وَهَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ فَإِنْ فَنِيَتْ حَسَنَاتُهُ قَبْلَ أَنْ يُقْضَى مَا عَلَيْهِ أُخِذَ مِنْ خَطَايَاهُمْ فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ ثُمَّ طُرِحَ فِي النَّارِ)) [1].

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئایا دەزانن موفلیس (ئەوەی کە هیچی نییە)کێیە؟ ئەوانیش فەرموویان: موفلیس ئەو کەسەیە کە نە پارەی هەیەو نەماڵیش، جا پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرمووی: نەخێر، موفلیس لە ئوممەتی مندا ئەوە نییە کە ماڵ و نە پارەی نییە، بەڵکو کەسێکە کە لە دونیادا نوێژی کردووە، ڕۆژووی گرتووە، زەکاتی داوە، بەلاَم جوێنی بە ئەو داوەو بوختانی بۆ ئەم هەڵبەستوەو، خوێنی ئەوی ڕشتووەو لەوی داوە، بۆیە لە ڕۆژی دوایدا لە چاکەکانی هەڵدەگیرێت و دەدرێت بەو کەسەی کە خراپەی بەرامبەر کراوە، وەئەگەر لە چاکەکانیشی تەواو بوو، ئەوە لە تاوانی کەسی بەرامبەری هەڵدەگیرێت و دەدرێت بەسەر ئەمدا، پاشان فڕێ دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخی.

جا ئازیزان.... بیرێك بکەنەوە توخوا چەند ناخۆشە کە لە دونیای پڕ کێشەو ناخۆشیدا ئەم هەموو هەوڵ و ماندووبوونەت داوەو هەروا بە ئاسانیش لە ڕۆژی دوایدا بدرێت بە خەڵکی!! هەر بۆیە (عبدالرحمن کوڕی مهدي) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: ((ئەگەر لە بەر ئەوە نەبوایە

---

[1] صحیح مسلم (٦٧٤٤).

کە غەیبەت کردن تاوانەو خوای گەورەش پێی ناخۆشە بکرێت، ئەوا ئارەزووم دەکرد هەرچی خەڵکی ئەم شارە هەیە غەیبەتیان بکردمایە، چونکە دەبێت چی شتێك لەوە خۆشتر بێت کە لە ڕۆژی دوایدا لە ناو کتێبی چاکەکانتدا کۆمەڵە چاکەیەك ببینیت، کە خۆت ئەنجامت نەداوە، وە ئاگاشت لێی نەبووە، جا لە چاکەی ئەوانەی کە غەیبەتیان کردووی یاخودماڵیان خواردووی یان هەر غەدرێکیان لەبەرامبەردا کردووی دەدرێ بە تۆی غەیبەت کراو بە بێ ئاگا)).

**دووەم: هەڵماڵینی کەم و کوڕی و عەیبی غەیبەت چی:** کە بە ڕاستی ئەمەیان زۆر لەو هەڕەشانەی تر ناخۆشترو ڕیسوایی کەرترە ئەویش ئەوەیە کە خوای گەورە خۆی عەیب و کەم و کوڕیەکانی غەیبەت چی هەڵدەماڵێت، هەروەك أبو برزة الاسلمي و براء کوڕی عازب (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرمویەتی: (( يَا مَعْشَرَ مَنْ آمَنَ بِلِسَانِهِ وَلَمْ يَدْخُلِ الإِيمَانُ قَلْبَهُ لاَ تَغْتَابُوا الْمُسْلِمِينَ وَلاَ تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ فَإِنَّهُ مَنْ يَتَّبِعْ عَوْرَةَ أَخِيهِ يَتَّبِعِ اللَّهُ عَوْرَتَهُ حَتَّى يَفْضَحَهُ فِي بَيْتِهِ))[1].

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ئەی ئەو کەسانەی کە بە دەم باوەڕتان هێناوەو ڕاستی باوەڕ نەچوّتە ناو دڵەکانتانەوە، غەیبەتی موسوڵمانان مەکەن، وە مەشکەڕێن بە دوای ناموس و کەم و

[1] مسند أحمد (٢٠٣٣٢)، صحيح سنن أبي داود ( ٤٠٨٣)، الترغيب والترهيب ( ٢٣٤٠).

کوڕیەکانیاندا، چونکە هەرکەسێك بە دوای عەیب و کەم و کوڕی براکەیدا بگەڕێت و شوێنی عەیبی برا موسڵمانەکەی بکەوێت، ئەوە خوای گەورە عەیبو کەم و کوڕیەکانی هەڵدەماڵێنێت، وە هەر کەسێکیش کە خوای گەورە عەیبی هەڵبماڵێت ئەوە ڕیسوای دەکات ئەگەر چی لە نیاو ماڵی خۆیشی دابێت. کەواتە ئەگەر دەتەوێت خوای گەورە عەیبت هەڵنەماڵێت و عەیبەکانت بپۆشێت لە ڕۆژی دوایدا ئەوە تۆ عەیبی خەڵك دەر مەخەو بیشارەوە.

**سێیەم:** سزای ناو گۆڕ: واتە غەیبەت کردن دەبێتە هۆی سزای گۆڕو ئازار دانی مرۆڤ لە ناو گۆڕدا، لە أبويعلى کوڕی سیابة (خوا لێی ڕازی بێت) ((أَنَّهُ عَهِدَ النَّبِيَّ (ﷺ) وأتى عَلى قَبرٍ يُعَذَّبُ صاحبه، فَقال: (إنَّ هذا كانَ يَأكُلُ لُحومَ النّاسِ) ثُمَّ دَعَى بِجَريدَةٍ رَطبةٍ، فَوَضَعَها عَلى قَبرِهِ، وقال: (لَعَلَّهُ أَنْ يُخَفَّفَ عَنْهُ مَا دَامَتْ رَطْبَةً)) [1]

واتە: (یەعلای کوڕی سیابە) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە تەنیشت گۆڕێکدا ڕۆیشت، فەرمووی: خاوەنی ئەم گۆڕە ئێستا سزای ناو گۆڕی لەسەرە، وە فەرمووی: (ئەمە کەسێك بووە کە گۆشتی خەڵکی خواردوە، واتە(غەیبەتیانی کردووە) پاشان داوای نەمامێکی دارخورمای

[1] أخرجه الإمام أحمد ( ٥/٣٥- ٣٦ ) وقال الشيخ شعيب الأرناؤوط: إسناده قوي.

کردوو لەسەر گۆڕەکە ناشتی و فەرمووی: ئومێد وایە سزای لەسەر سووك بکرێت هەتاکو ئەم دارە بە سەوزی بمێنێتەوە.

**چوارەم: سزای ئاگری دۆزەخ:** هاوەڵی بەڕێز أنس کوڕی مالك (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((**لَمَّا عُرِجَ بِي مَرَرْتُ بِقَوْمٍ لَهُمْ أَظْفَارٌ مِنْ نُحَاسٍ يَخْمِشُونَ وُجُوهَهُمْ وَصُدُورَهُمْ فَقُلْتُ مَنْ هَؤُلَاءِ يَا جِبْرِيلُ، قَالَ: هَؤُلَاءِ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ لُحُومَ النَّاسِ وَيَقَعُونَ فِي أَعْرَاضِهِمْ**)) [٢].

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: کاتێك شەوڕەوییم پێکرا بەرز کرامەوە بۆ ئاسمانەکان بەلای کۆمەڵێکدا تێپەڕیم کە نینۆکی مسیان هەبوو دەم و چاوو سنگی خۆیان ئەڕوشان و دادەڕنی، منیش بە (جبريل)م (عليه السلام) ووت: ئەمانە کێن؟ ئەویش فەرمووی: ئەوانە جۆرە کەسانێکن کە گۆشتی خەڵکیان خواردووە (غەیبەتیان) کردووە، باسی عەیب و ناموسی خەڵکیان کردووە.

---

[٢] رواه ابوداود (٤٨٧٨/ ٤٨٨٠)، والطبراني في المعجم الأوسط(٨).

**پێنجەم:** هاوەڵی بەڕێز إبن عمر (خوا لێیان ڕازی بێت) دەفەرمووێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: ((مَنْ قَالَ فِي مُؤْمِنٍ مَا لَيْسَ فِيهِ أَسْكَنَهُ اللَّهُ رَدْغَةَ الْخَبَالِ حَتَّى يَخْرُجَ مِمَّا قَالَ)) [1].

واتە: (عبدالله کوڕی ئیمامی عُمر) (ڕەزای خوایان لێبێت) دەفەرمووێت: گوێم لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: هەرکەسێك قسەیەك بە باوەڕدارێك بڵێت و واش نەبێت، ئەوە خوای گەورە دەیخاتە ناو کێم و زوخاووی ئەهلی دۆزەخەوە، تا واز لەقسەکەی نەهێنێت.

کەواتە ئێستا زانرا کە غەیبەت کردن چەندێك زیان و زەرەری هەیە وە ئایا چ هەڕەشەیەك کراوە لە کەسانی غەیبەت چـی، بۆیە موسڵمانان بەڕاستی زۆر پێویستە موسڵمان زۆر ئاگادار بێت و خۆی بپارێزێت لەو تاوانەو گوێگرتن لێی، وەبشزانە کە گوێ و دڵ بەرپرسیارن بەرامبەر بەگوێگرتن لەغەیبەت، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ٣٦﴾ (الإسراء:٣٦).

واتە: گوێ و چاوو دڵ هەموویان بەرپرسیارن لە گوێ گرتن و تێڕوانین و ئارەزوو کردنی تاوان و غەیبەت.

---

[1] صحيح سنن أبي داود (٣٠٦٦).

## کەسی گوێگر بۆ غەیبەت یەکسان و بەشداره له تاوانەکەدا

بەڵێ نەك هەر غەیبەت کردن تاوان بێت و بەس نا بەڵکو گوێ بۆ گرتن و بێ دەنگ بوونیش لەسەر غەیبەت کردن بەشدارت دەکات لەو تاوان و خراپەیەدا، بۆیە زۆر بەووردی سەرنجێك لەو فەرموودەیەی پێشوو بدەو ئینجا خۆت بەراورد بکە بەو شێوەیە، لەوەدا کە کەهەردوو ئیمامی (ئەبو بەکرو ئیمامی عومەر) (خوایان لێ رازی بێت) یەکێکیان بەوی تریانی ووت: چۆن خەوتنێك خەوتووە دەڵێی لەماڵی خۆیانە، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) چ وەڵامێکی هەبوو بۆیان؟ بۆیە عبدالله کوری مُبارك (رەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمووێت: ((فِرَّ من المغتاب فرارك من الأسد)).

واتە: ڕاکەو خۆت بەدوور بگرە لە کەسی غەیبەت چی هەروەك چۆن ڕادەکەی لە دەست شێرێك کە ترسی ئەوەت هەیە بتخوات.

## خەوێکی سەرسوڕهێنەرو ترسناك

(کهمس کوڕی عبدالله) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: گوێم لە (مەیمونی کوڕی سیاه) بوو (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەیفەرموو: جارێکیان دانیشتبووین لە مەجلیسێکدا باسی کەسێکیان کرد، بەشێوەیەکی خراپ و غەیبەتیان کرد، مەیمونیش فەرمووی: منیش هیچم نەووت نەبە چاك نە بەخراپ، پاشان کە لە دانیشتنەکە هەستاین و چوومەوە بۆ ماڵەوەو خەوتم، خەوم بینی ئەوەبوو لە خەومدا کەلاکێکی گوێ درێژیان بۆ هێنام و لە بەر دەممدا دایانناو کەسێکیش لە دیار سەرم بوو خێرا خێرا دەیووت: بخۆ، منیش هەر دەم ووت: چی بخۆم ئاخر بۆچی بیخۆم چۆن بیخۆم؟ کەسەکەش دەیووت: بیخۆ، چونکە لەو مەجلیسەی تیایا دانیشتبووی غەیبەتی فلانە کەس کراو تۆش بەشدار بوویت، ئەمیش دەڵێ: لەخەوەکەمدا ووتم: ئاخر خۆ من هیچم باس نەکرد، دەڵێ: کەسەکەش پێی ووتم: ئاخر تۆ گوێت بۆگرت و بێ دەنگ بوویت، کە ئەوەش نیشانەی ڕازی بوونە. بۆیە(کهمس کوڕی عبدالله) دەفەرموێت: لەو ڕۆژەوە نەمان بینی مەیمونی کوڕی سیاه غەیبەت بکات و لە مەجلیسی غەیبەتدا دابنیشێ، وە ئەگەر غەیبەتیش بکرایە ئەوا ڕێی لێ دەگرت و نەیدەهێشت،

وە ئەگەر کەسی غەیبەت چی هەر وازی نەهێنایە ئەوا مەیمونی کوڕی سیاە ئەو جێگایەی بە جێ دەهێشت و دەڕۆیشت}[1].

وسمعك صن عن سماع القبيح كصون اللّسان عن النطق به

فإنك عند سماع القبيح شريك لقآئله فانتبه

واتە: گوێت بپارێزە لە بیستنی ووتەی خراپ و تاوان (غەیبەت) وەك پاراستنی زمانت لە قسەی خراپ، کاتێك کە تۆ گوێ دەگریت بۆ بیستنی ووتەی خراپ و تاوان (غەیبەت) بێگومان بەو ئاگاداربە کە بەشداری لەو تاوانەدا

جا برا و خوشکی سەنگین و بەڕێز: زۆر ئاگاداربە لە هاوڕێیەتی کەسانی غەیبەت چی، سوێند بە خوا دانیشتن لەگەڵ مردووەکاندا باشترە لەوەی لە گەڵ کەسی غەیبەت چیدا دابنیشیت و هەڵس و کەوت بکەیت، بۆیە هەرئەم جۆرە کارەبوو کە وای لە پیاو چاکان کردبوو (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) کە زیاتر لە گۆڕستان کاتەکانیان بە سەر بەرن، ئەم کارەشیان هەر لەبەر ئەوەندە بوو ئەگەر پرسیارت لێیان بکردایە ئەم کارو پیشەیە بۆچی؟ لە وەڵامدا دەیان ووت: لەبەر ئەوەی

(١) بڕوانە: صفة الصفوة (٣/١٥٤)

ئەگەر لەناویاندا بین ئازارمان نادەن، وە ئەگەر لایان ڕۆیشتین ئەوە (غەیبەتمان) ناکەن (واتە: مردووەکان).

بەڵێ دانیشتن لە گەڵ کەسانێك کە بە لاشە مردوون بە دەست هێنانی چاکەیە و خۆ بەدور گرتنە لە تاوانی غەیبەت، بەڵام دانیشتن لە گەڵ کەسانێك کە دڵیان مردووەو گوێ نادەن بە تاوان توش بوونە بە تاوان و خراپەکاری.

بِشري کوڕی حارِث (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: بەسە بۆ ئێوە دانیشتن لە گەڵ کەسانی مردوو کە دڵەکان بە یادیان زیندوو دەبنەوە، بەڵام کەسانێکی زیندوو -بەلاشە- دانیشتن لە گەڵیانداو سەیرکردنیان چاوی پێ کوێر دەبێت.

## کەسی غەیبەت چی ترسنۆکەو کەسایەتیەکی لاوازی هەیە!

موسـڵمانە خۆشەویـستەکان ئایـا دەزانـن کەسـی غەیبـەت چـی کەسایەتیەکی لاوازو کەسێکی زۆر ترسنۆکە؟ لەبەر ئـەوەی کـە ناتوانێـت ڕووبەڕووی خاوەن عـەیب بڵێت تـۆ کەسێکی ئاوایـت و ئاوایـت، بێگومـان ئەمەش ترسنۆکی و لاوازی ئەو کەسە دەردەخات، چونکە دەی ئەگەر ئـەو کەسە ڕاست دەکات فـەرموو بـا لـە بـەر چـاوی خـۆی یـان لای خـۆی ئـەو قسەیەی پێ بڵێت، بۆیە بەڕاستی ئیماندار ئاوێنەی ئیمانداره، بـا لەڕاسـت خـۆی چـی هـەیـە بیڵێـت و ئامۆژگاریـشی بکـات، بـەڵام بەداخـەوە زۆریـش بەداخەوە ئەمڕۆ ئەو ڕەوشتە لەناوماندا باری کردووەو دەستووری ڕەوشتی وا هاتۆتە نێومان کە هیچ یاساو ڕێسایەك تەقـەبولی ناکـات، بۆیـە وابـزانم هیـچی تێـدا نییـە ئەگـەر کەسـێك بیـەوێت لەبەرامبـەر خـاوەن کـەم و کوڕیەکەدا چی هەبێت پێی بڵێت، ئەو کاتـە گومـانی تێدانییـە کـە ئـەمیش کەسێکی سوپاس کـراو دەبێـت و لـەدوا ڕۆژیـشدا کەسـێکی پاداشـت دراو دەبێـت و دەشـچێتە ڕیـزی ئـەو کەسـانەی کـە فـەرمان بـە چـاکەو نـەهی لەخراپە دەکەن، بۆیە زۆر پێویستە کە لەم خاڵەدا بە خۆماندا بـچینەوەوە ببینە ڕێ ڕۆشـن کـەرەوەش بـۆ کەسـانی تـر لەڕاسـتیدا ئەمەیـە ڕەوشـتی موسوڵمانی ڕاستەقینە، کەواتە زووکەو ناوی خۆت لەنێو ئەوانەدا تۆماربکە

كە بڕیاریـان داوە تـەواو واز لـە غەیبـەت بهێـنن و بـە دوای عـەیب و عـاری خەڵكی دا نەگەڕێن.

هـەر بۆیـە خـوای گـەورە دەفـەرموویت: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾ (فصلت:٣٣).

واتە: كـێ لـەو كەسـە چـاكترەو قـسەی باشـترە كـە بانگـەوازی خـەڵكی دەكات بۆلای خواو پاشان كردەوەی چاك ئەنجام دەدات و دەڵێـت مـن لـە موسوڵمانانم، ئەمیش بەوەی كە بانگی خەڵكی دەكـات بـۆ چـاكەو فێریـان دەكات نەك هەر لە پاشملە باسیان بكات و غەیبەتیان بكات.

## کەسی غەیبەت چی باوەڕی لاوازە!

لەسەرخۆبە کەسی غەیبەت چی ئایا دەزانی کە باوەڕت لاوازەو ئیمانت تەواو نییە؟ ئایا گوێبیستی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەبوویتە کە دەفەرموێت: ((لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ)) [1].

واتە: هەرکەسێك چی بۆ خۆی پێ خۆشە بۆ برا موسوڵمانەکەشی بەهەمان شێوە پێی خۆش نەبێت ئەوە باوەڕی تەواو نییەو لاوازە، لێرەوە ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە بەڕاستی کەسی باوەڕدار پێویستە لەگەڵ بەرامبەرەکەی بەو شێوەیە بێت کە لە فەرموودەکەدا دەردەکەوێت، وەبشزانە گەورەترین بەخششی خوایی بۆ مرۆڤ (ئیمانە)، بەلاَم هەرکات غەیبەتت کرد (کە مانای پێ ناخۆش بوونتە بەرامبەر ئەو کەسە) ئەوە بەر ئەو فەرموودەیەی سەرەوە دەکەویت(پەنا بەخوا).....

---

(١) صحيح البخاري (١٣)؛ وصحيح مسلم(١٧٩)

## چی کاتێك باس کردنی پاشمله دروستەو ڕێگە پێدراوە ؟

موسـڵمانە خۆشەویـستەکان.... پـاش ئـەوەی ترسـناکی غەیبـەت و گـەورەیی سـزاکەی ڕوون بـووە، بەپـشتیوانی خـوای گـەورە بەپێویـستی دەزانم کە ئەو حاڵەتانەش باس بکەین کە دروستە (غەیبەت) کردن تیایدا، بـەڵام دەبێـت کەسـی بـاوەڕدار زۆر ئاگاداربێـت کـە بـە هـۆی ئـەم چـەند حاڵەتەوە نەکەوێتە باس کردن و کاری حەرامەوە، بەڵکو بە پێی پێویستی خۆی و کاتێکیش باسی کەسێك دەکات دەبێت نیـەتی بـاش و پـاك بێت لەوشتانەداو لەڕق و کینەوە نەبێت، بۆ شکاندنەوەی نەبێت، چونکە خـوای میهرەبان ئاگاداری هـەموو نهێنیـە کـانی نـاو دڵـە، **بـۆیـە لـەم کاتـانـەدا غەیبەت کردن دروستە :**

**یەکەم:** ستەم کردن، لەم کاتەدا دروستە کە ستەم لێ کراو سکاڵای خۆی باس بکات بۆ کاربەدەستان و فەرمانڕەوایان، یاخود بۆ قازی و دادوەر و بڵێت: فلانەکەس ستەمی لێ کردووم یان ماڵی خواردووم، کە ئەم گێڕانەوەیە تەنها بۆ گەڕانەوەی مافەکەتە و نابێتە غەیبەت، بەڵگەی ئەمە ئەوەیە کاتێك (هندی کچی عوتبە) کە دەکاتە خێزانی (ئەبو سوفیان) (ﷺ) هات بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتی: ((یا رَسولَ اللَّهِ إنَّ

أبا سُفيان رَجُلٌ شَحيحٌ وَلَيسَ يُعطِيني ما يَكفِيني وَوَلَدي، إلاّ ما أخَذتُ مِنهُ وَهُوَ لا يَعلَم))

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبو سوفیان پیاوێکەماڵەکەی زۆر بە توندی گرتووەو شتێکی وام نـاداتێ کـە بەشـی خـۆم و منداڵـەکانم بکـات تەنها ئەوە نەبێت کە من لێـی ئەبـەم بـەبێ ئـەوەی خـۆی ئاگاداربێت، وە منیش پێویستم بەوە هەیە کە لە ماڵەکەی بەرم و بیکـەم بـە مەسـرەف و خەرجی خۆم و منداڵەکانم، ئایا بە بێ ئاگای ئەو لە ماڵەکەی سەرف بکـەم تاوان بار نابم؟ پێغەمبەری خواش (ﷺ) فـەرمووی: ((خُذِی مَـــا یَکْفِیـــكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ))[1].

واتە: بەشی خۆت و منداڵەکانتی لێ ببەو مەسرەفیانی لێبکە بە چاکە.

**دووەم: پرس و ڕاوەرگرتن**، ئـەمیش بـەوەی کـە کەسـێك بـچێتە لای کەسێکی شـارەزا لەدینـداو بڵێـت ئـەرێ فلاّنەکـەس چـۆنە کـە مـن بـە تەمام کچی بدەمێ؟ یان خوشکەی بدەمێ؟ یـان فلاّنـە ئـافرەت چـۆنە کـە من بەتەمام بیخوازم؟ یاخود بـۆ پرسـیار کـردن دەربـارەی هاوسـێیەتی؟ هەروەك چۆن (فاتیمەی کچی قەیس) هاتە خزمەتی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) پێـی ووت: ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) (أبـــوجهم و معاویـــة) داخوازیـان

(١) صحيح البخاري (٥٣٦٤) وصحيح مسلم (١٧١٤).

کردووم، منیش نازانم شوو بە کامیان بکەم، پێغەمبەری (ﷺ) فەرمووی: ((أَمَّا أَبُو جَهْمٍ فَلاَ يَضَعُ عَصَاهُ عَنْ عَاتِقِهِ وَأَمَّا مُعَاوِيَةُ فَصُعْلُوكٌ لاَ مَالَ لَهُ))[٢].

واتە: ئەبو جەهم گۆپاڵەکەی (واتە دارەکەی) لەسەر شانیەتی، واتە لە گەڵ ژندا خراپە هەمیشەداری بۆ ئامادە کردووە، بەڵام هەرچی موعاویەیە هەژارەو هیچی نییە.

**سێیەم: داوای یارمەتی کردن بۆ گۆڕینی خراپە (تَغيير المُنكَر)** وەلادانی ناڕەحەتییەك لەسەر موسوڵمانێك، وەك ئەوەی کە یەکێك بچێتە لای کەسێکی دەسەلاتدارو پێی بڵێت: فلانەکەس لە گەڵمدا خراپەو ئازارم دەدات، بۆیە داوات لێدەکەم تا ڕێگە چارەیەکم بۆ بدۆزیتەوە.

**چوارەم: ئاگادارکردنەوەی موسوڵمانان و ئامۆژگاری کردنیان بۆ خۆ پاراستن** لەو کەسانەی کە خراپن و زەرەرو زیانیان هەیە بۆ موسوڵمانان. (زەیدی کوڕی ئەرقەم) (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: لە گەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەرچوین لە سەفەرێکدا لەوێدا تووشی ناڕەحەتیەکی زۆر بووین، ئەوەبوو (عبدالله کوڕی ئوبەییەی سەلول) بە هاوەڵانی خۆی ووت : هیچ کەس یارمەتی هاوەڵانی پێغەمبەر

---

[٢] صحيح مسلم ( ١٤٨٠).

(ﷺ) نەدات تاکو هەموویان لێی جیا دەبنەوە، وەوتیشی گەرگەڕاینەوە بۆ مەدینە دەستەلأتدارو بەتواناکان زەلیلەکان دەردەکەین، جا (زەید)دەفەرمووێت: منیش چووم بۆلای پێغەمبەرو (ﷺ) ووتم: (عبداللەی کوڕی ئوبەییەی سەلول) (گەورەی دووڕووەکان) ئاوای ووتووە، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردی بە شوێنیداو پرسیاری لیێ کرد کە گوایە وات ووتوە، ئەویش کەوتە سوێند خواردن و پاساو هێنانەوەو بە درۆ خستنەوەی (زەید)، جا وا بلاو بوەوە ووتیان (زەید) درۆی لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد، (زەید)یش (خوای لیێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: بەڕاستی زۆر لەسەر دڵم گران بوو کە وایان ووت: تا خوای گەورە ئەم سورەتەی دابەزاند: ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ﴾، وە خوای میهرەبان بە ڕاستی خستمەوە، پاشان پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) بانگیانی کرد تا پەشیمان ببنەوەو ئەویش داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکات، بەلأم ئەوان پشتیان هەڵکرد.

**پێنجەم: باس کردنی کەسێک کە بە ئاشکرا تاوانی لێبووەشێتەوە**، وەك {جاسووسی کردن و زینا کردن و مەی خواردنەوە و.......هتد} لەم کاتەشدا تەنها باسی ئەو تاوانەی دەکەیت و بەس.

**شەشەم: پێناساندنی کەسێک:** ئەویش بە دیاری کردنی ئەو کەم و کوڕیانەی کە لە ڕووی کەم ئەندامی و لە ش و لاریەوە یاخود ناوو شۆرەتیەوە، وەك کوێری و نەخۆشی و شەلی و قەڵەوی و کەڕی...هتد وەنابێت لەمەشدا مەبەستی پیشاندانی کەم و کوڕی و سوکی ناوبراو بێت، بەڵکو دەبێت تەنها پێناساندنی بێت.

**حەوتەم: باس کردنی کەسی بیدعەچی و تاوانبار،** لەم کاتەشدا تەنها باسی بیدعەکەی یاخود تاوانەکەی دەکەیت، وە باسی هیچی تر ناکەیت مەگەر یەکێك لەو خاڵانەی پێشووی تێدابێت، خاتوو (عائیشە)ی دایکی باوەڕداران (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت:(جارێکیان پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) ڕووخسەتی لێ خواست و ئەویش بە ڕێزەوە بە خێرهاتنی کردوو فەرمووی لێ کرد، پاشان کە پیاوەکە ڕۆیشت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بئس أخو العشيرة) واتە: خراپترین برای هۆزەکەیە، هەروەها دایکمان خاتوو (عائیشة) (خوای لێ ڕازی بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَا أَظُنُّ فُلاَنًا وَفُلاَنًا يَعْرِفَانِ مِنْ دِينِنَا شَيْئًا)) [1].

---

[1] صحيح البخاري (٦٠٦٧)

واتە: گومان نابەم و هەست ناکەم کە ئەم دوو کەسە هیچ دەربارەی شەرع و دینەکەمان بزانن.

هەروەها کەسی بیدعەچی کە زیادەیەك دەهێنێتە ناو دینەوە، خوا دەپەرستێ بەلأم بە بۆچوون و هەواو ئارەزووی خۆی، بەبێ گوێ دانە فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بۆیە لەم کاتەدا باس کردنی پاشملە (غەیبەت)ی واجبە، چونکە ئەوە بۆ پاراستنی دینە لە هەواو ئارەزوو، (ولا غيبة لأحد من أهل البدع) وە هیچ کەسێك کە بیدعە دەکات باس کردنی بیدعەکەی غەیبەت نییە، کەواتە ئێستا ڕوون بۆوە بۆ بەڕێزت کە باس کردنی ئەو کۆمەلأنە غەیبەت نییە، وە دەتوانی باسیان بکەیت و هەرکاتیش باسی ئەوانەشت کرد ئەوە دەبێت ڕەچاوی ئەم خالأنەش بکەیت:

١. دڵسۆزی تەواوت هەبێت لەو باسکردنەدا و نیەتت تەنها ئەوە بێت خراپەکەی بگۆڕیت، چونکە هەرکەسێك مەبەستی گۆڕینی خراپەکەی نەبێت ئەوە بزانە دەبێتە غەیبەت.

٢. باسی کەسەکە دەکەیت دەبێت بۆ بەرژەوەندی ئەو بێت، ئەگەر نا ئەوە دەبێت بزانی ئەوەش لە هەواو ئارەزووی خۆتەوەیەو برایەتیت بپارێزە نەك ئەوەی هەربچووك ترین هەڵەت تیابینی بیکەیتە بیانوو، بڵێی وەالله ئەوە واو وای کرد، نەخێر، موسوڵمانی خۆشەویست تکات لێ

دەکـەم خـۆت بپـارێزە، چـونکە شـەیتان زۆر فێـڵ بـازەو نـەشمردووە بەردەوامە لە سەر فڕو فێڵەکانی.

٣. بزانــە کــە بــاس کــردن و غەیبــەت کردنــی براکــەت خراپــەی تــری بەدواوەیە، بۆیە ئاگاداربە نەبێتە مایەی شەڕو ئاژاوەو ڕق و کینــەی نێـوان موسوڵمانان.

## زمان گرتن و غەیبەت نەکردن جیهاد و تێکۆشانە

زۆر کەس بەلایەوە سەیرە کە گوێبیستی ئەم قسەیە دەبێت، بۆچی (غەیبەت) نەکردن جیهادو تێکۆشانە؟ بەڵێ براو خوشکی ئازیز.... هیچ بەلاتەوە سەیر نەبێت، بگرە گەورەترین جیهادو تێکۆشانیشە، چونکە بزانە سەری هەموو فیتنەو بەڵاکان تەنها لە زمانەوە دەبێت، هەروەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: ((الْمُجَاهِدُ مَنْ جَاهَدَ نَفْسَهُ فِي طَاعَةِ اللَّهِ)) [(١)].

واتە: موجاهیدو تێکۆشەر ئەو کەسەیە کە جیهادی نەفسی خۆی دەکات لە گوێڕایەڵی خوای گەورەدا، وە بەرەنگاری هەواو ئارەزووەکانی دەبێتەوە، وە خۆشی دەپارێزێت لە باس کردن و غەیبەت کردنی کەسانی بەرا مبەر.

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: ((أفضلُ الجهادِ أن تُجاهدَ نَفْسَكَ وَهَوَاكَ فِي ذاتِ اللهِ–عَزَّ وَجَلَّ)) [(٢)].

---

(١) جزء من حديث أخرجه الإمام أحمد ، بڕوانە: السلسلة الصحيحة (٥٤٩).

(٢) أخرجه أبو نعيم في الحلية والديلمي وغيرهما،بڕوانە: السلسلة الصحيحة (١٤٩٦).

واتە: باشترین و خێرترین جیهاد ئەوەیە کە تێبکۆشیت لە بەرامبەر هەواو ئارەزووەکانتدا وەتەنهاش لەبەر خاتری خوای پەروەردگار.

بۆیە تێکۆشان لەپێناوی خوادا بە گیان و ماڵ لەبەرامبەر دوژمناندا جاری واهەیە لە ماوەیەکی زۆردا نایەتەدی لە ژیانی موسوڵماندا، بەلاّم جیهادی نەفس بەردەوامەو کۆتایی پێ نایەت، تا ڕوح لە لاشەدابێت، کەواتە پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێك بەرەنگاری هەواو ئارەزووەکانی ببێتەوە ە ڕێگری بکات لە غەیبەت و حوکمی خواش لە دڵی خۆیدا بچەسپێنێت، تاکو خوای گەورەش لە سەر زەویدا بەرپای بکات.

بەڕێزەکەم لەوانەیە لە کاتێکدا کە ئەم نامە شەرعیە دەخوێنیتەوە بە بیرتدا بێت باشە بۆچی و چۆن دەبێت جیهاد بە نەفس گەورەترو خێرتر بێت لە جیهادکردن بە ماڵ و گیان (ڕوح)؟؟ بەلاّم بزانە ئازیزەکەم ڕاستەو گومانی تێدا نییە کە موجاهیدان ڕێزو پلەو پایەیان لەسەرووی هەموو موسوڵمانانەوەیە کە ئەو بەڕێزانە خوێن و ماڵ و گیانیان لە پێناوی خوادا بەخت کردووەو تێکۆشاون بۆ بەرزکردنەوەی ووشەی خوا و بەرپاکردنی حوکمی خواو نەهێشتنی خراپەو تاوان، وە کارەکەشیان ڕەنگدانەوەی فەرموودەکانی خواو پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، بەلاّم تۆ خۆ ئێستا لە نێو جەنگ و جیهاددا نیت نا بەڵکو لە نێو ماڵی خۆتدایت یاخود لەناو دوکان و شوێنە گشتیەکاندایت وەك ((قوتابخانە یان نەخۆشخانە یاخود هەر

پلەیەکت هەبێت ....هتد)) بۆیە پێویستە لەو شوێن و کاتەی کە تیایدایت خـۆت بپارێزیـت لـە تـاوان و غەیبـەت وفیتنـەو جاسووسـی و دوو زمـانی، ئالێرەدا دەردەکەوێت کە ئایا تۆ موجاهیدی ڕاستەقینەی یان نا بە رامبـەر هەواو ئارەزووەکانت.

## چەند ووتەیەکی زێرین سەبارەت بە خراپی ( غەیبەت )

١. جارێکیان عەمری کوڕی عاص (خوای لێ ڕازی بێت) لەگەڵ هاوەڵانیدا بە تەنیشت ئەسپێکی مردارەوەبودا تێپەڕین و پێیانی فەرموو: ئەگە ر پیاوێك لە گۆشتی ئەو ئەسپە مردارە بووە بخوات و ناوسکی لێ پڕ بکات زۆر باشترە لەوەی کە گۆشتی براکەی بخوات، واتە (غەیبەت)ی بکات.

٢. (عبداللە ی کوڕی موبارەك) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمووێت: ئەگەر بمویستایە غەیبەتی هەر کەسێك بکەم ئەوا غەیبەتی دایك و باوکی خۆم دەکرد، چونکە دایك و باوکم لە هەموو کەس شایستەتر لە پێشترن کە چاکەیان لەگەڵدا بکەم.

٣. بەیەکێك لە پیاوچاکان ووترا: فلانەکەس غەیبەتی کردووی: ئەویش هەستاو سەبەتەیەك خورمای بۆ بردوو پێی ووت: بیستوومە کە تۆ چاکەکانی خۆت بە دیاری ناردووە بۆ من، منیش دەمەوێت پاداشتت بدەمەوە، سەبەتە خورماکەی پێداو پێی ووت: زۆر داوای لێبوردنت لێ دەکەم کەناتوانم بە تەواوی پاداشتەکەت بدەمە.

٤. غەیبەت میوەی فاسقەکانە.

٥. هەرکەسێك زمانی بپارێزێت و ئاگاداری بێت لە هەموو شەڕو ئاشوبێك ڕزگاری بووە.

٦. جارێکیان پیاوێك باسی کەسێکی کرد لای هاوڕێکەی، هاوڕێکەشی پێی ووت: ئایا جیهادت بەرامبەر ڕۆمەکان کردووە؟ ووتی: نەخێر، ووتی: ئایا ئەی جیهادت بەرامبەر فارسەکان کردووە؟ ووتی: نە خێر، پاشان ووتی: (سَلِمَ منكَ الرُّوم، وَسَلِمَ مِنكَ التُّركَ، وَلَمْ يَسلَمْ مِنْكَ أخوكَ المُسلم)

واتە: بەڕاستی ڕۆمەکان لە دەم و دەستت سەلامەتن (باسیان ناکەیت)، وە تورکەکانیش بەهەمان شێوە لە دەم و دەستت سەلامەتن، بەلاّم برای موسوڵمانت لە دەم و دەستت سەلامەت نین (باسیان دەکەیت و غەیبەتیان بچوکترین هەڵەیان لێدەکەیت بە ئەندازەی کێوێك، ئەوەندەی باسی موسڵمانان دەکەیت، باسی بێباوەڕو خراپەکارو نوێژنەکەرو خراپەکاران و دوژمنانی سەرسەختی دین ناکەیت!! کە ئەمەش بەڕاستی فریو خواردنە بە دەست شەیتان و دوژمنانی خواوەو بێئاگاییە لە پاراستنی مافی برایەتی نێوان موسڵمانان و تێکدانی ڕیزی پتەوی برایەتیانە!!!)، بەڵێ بەڕاستی وایە ڕۆژگار لای ئەمڕۆی موسوڵمان هەمووی پڕە لە نەهامەتی و نەگبەتی و ناخۆشی، چونکە ئەوەندەی بەیەکەوە خەریکن و لەنێو خۆیاندا خەریکن لە سەدا یەك باسی بێ باوەڕان و ستەم کاران ناکەن.

٧. موسڵمانی خۆشەویست ئەگەر هەر بێ دەسەڵاتی و توانای جێ بەجێ کردنی ئەو خاڵانەی پێشووت نییە، ئەوا هەوڵ بدە کە ئەم سێ خاڵە لە خۆتدا جێ بەجێ بکە:

- ❖ ئەگەر چاکەت پێ ناکرێ هەوڵ بدە خراپەش مەکە.
- ❖ ئەگەر ناتوانی سوودت هەبێت بۆ خەڵکی ئەوا زیانیشیان پێ مەگەیەنە.
- ❖ ئەگەر ناتوانی ڕۆژووی سوننەت بگریت و دەمت بگریتەوە لە خواردن و خواردنەوە ئەوا هەوڵ بدە لە گۆشتی خەڵکیش مەخۆ (باسیان مەکەو غەیبەتیان مەکە).

## کە فارەتی غەیبەت ( تەوبە کردن لە غەیبەت )

براو خوشکی زۆر بەڕێزم پێویستە ئەوەش بزانیت کە تەوبەو گەڕانەوە لە هەموو تاوانێك واجبەو غەیبەتیش یەکێکە لەو تاوانانە، کە پێویستە تەوبەی لێ بکەیت و بگەڕێیتەوە، بۆیە خێراکەو دەست پێشخەری خۆت بکە بۆ تەوبەو گەڕانەوە، چونکە بەڕاستی خوای گەورە لێخۆشبووە بۆ هەموو تاوانەکانت، تەنها خوای کارجوانیش دەتوانێت لێت خۆش بێت، بۆیە ئەو کەسەی کە لە پاشملە تاوانی غەیبەتی ئەنجام داوە، ئەوە دوو تاوانی ئەنجام داوە:

**یەکەم**: تاوانی شکاندنی فەرمانی پەروەردگار ئەو فەرمانەی کە دەفەرموویت: ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا﴾ وە بۆ ئەوەی لە سزای ئەو تاوانە دەربچیت و ڕزگارت بێت پێویستە واز لە غەیبەت بهێنیت و پەشیمان ببیتەوە لەو ئاکارانە بەتایبەتیش ئەوانەی کە لە پێشوودا ئەنجامت داوە، وەناشبێت جارێکی تر بگەڕێیتەوە سەری.

**دووەم**: تاوانی دەرخستن و باس کردن و بڵاوکردنەوەی عەیب و کەم و کەسی غەیبەت کراو، بۆ ڕزگاربوون لەم تاوانەش پێویستە گەردنی خۆت بە کەسی غەیبەت کراو ئازاد بکەیت و داوای لێ بوردنی لێ بکەیت، ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر پێی ناخۆش نەبوو پێت ووت، بەڵام ئەگەر زانیت پێی ناخۆشەو پێی بڵێی ئاوها و ئاوهام پێت وتووە یان غەیبەتم کردووی، ئەو کاتە پێویستە داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەیت لای پەروەردگار.

كەواتە بەڕێزانە ..... ئێستا بابەتەكە بەرەو كۆتایی دەڕوات و ئێوەو منیش گەیشتینە ئەو ئەنجامەی كە غەیبەت چەند ترسناكەو چۆن باس كراوە، دەی بائێمەش پەیمان بدەین بەخوای گەورەو میهرەبان و لە دانیشتن و كۆڕو كۆبوونەوەو نوسین و ووتارمان و ئاخاوتنی نێو خیزانماندا ئەم فەرمۆودانە بكەینە درووشم، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴾ (ق:١٨) واتە: هەر قسەیەك بكەن و لە زمانتان دەربچێت ئەوە بێ گومان مەلائیكەیەكی چاودێر بە سەرتانەوەیەو دەینووسێت، یان خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرمووێت: ((مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ))[1].

واتە:هەر كەسێك باوەڕی بە خواو پاشەڕۆژ هەیە با قسەی باش بكات یا بێ دەنگ بێت.

**لە كۆتایدا داواكارین لە خوای گەورە كە هەموو ماندوبوون و تێكۆشانێكمان تەنها لەبەر زاتی خۆی بێت و بەشی نەفس و هەواو ئارەزوو و هیچ كەسی تێدا نەبێت، بەردەوامیمان پێببەخشێت لەسەر ڕێگا ڕاستەكەی ئیسلام، آمـــــــیـــن.**

وأخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين وصلى الله وسلم على محمد وعلى اله وصحبه وسلم.

---

[1] رواه البخاري (٦٠١٨)، ومسلم(١٨٢).

# ناوەڕۆک

